# هۆکار و  چارەسەری دڵەڕاوکێی کچان لە هاوسەرگیری

نووسین: عبداللّٰه خاکی

## ناسنامەی کتێب

ناوی پەرتووک: هۆکارو چارەسەری دڵەڕاوکێی کچان لە هاوسەرگیری

نووسین: عبداللە خاکی

پێداچوونەوە: م. ڕەنج شێخانی

نەخشەسازیی بەرگ: عوسمان محمد

نەخشەسازیی ناوەوە: عبداللە خاکی

نرخ: بۆ فرۆشتن نییە لەپێناو خودا دەبەخشرێ.

نۆرە و ساڵی چاپ: دووەم، ١٤٤٢ کۆچی – ٢٠٢١ میلادی

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە «٣٨»ی
ساڵی «٢٠٢١»ی پێ دراوە.

﴿فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ﴾النساء{٥٩}

ئەگەر لە هەر شتێكدا بوو بە كێشەتان، ئەوە ئەو كێشەیە بگەڕێننەوە بۆ لای حوكمی خودای گەورە پاشان پێغەمبەرەكەی ﷺ كە "قورئان و سوننەت" دەگەیەنێت.

بۆ هەر پێشنیارو رەخنەو تێبینییەك یان بۆ هاوكاری كردن لەوەی چاپی بكەینەوە یە ئیزنی الله تعالی دەتوانن پەیوەندی بكەن بە ئەكاونتی فەیسبووكم بەناوی (عبدالله خاكی) یان پەیوەندی بە تێلگرام و فایبەر و واتس ئەپی ئەم ژمارەیەوە (٠٧٥٠٧٦٤٣٥٢٤) بكەن.

# پێشکەشە

- بە هەموو هاوسەرانی ئیماندار لە هەر کوێیەک بن.
- بەو گەنجانەی خولیا و ئاواتیان لە دونیادا تەنیا ڕەزامەندیی خودا و بەدەستهێنانی بەهەشتی فیردەوسە.
- بەو گەنجانەی ڕێبازی پێشەوا موحەممەد موستەفا ﷺ دەکەنە چرای ڕێگەیان و شوێنی بستبەبستی ئاکار و سوننەتی ئەو دەکەون.
- بەو گەنجە سەرڕاستانەی تامەزرۆن و، ئاواتی ژیانێکی پڕ لە ئیمانی دەخوازن لەگەڵ هاوسەرانیان.
- بەو کچانەی ئیمان و ئیسلام دەکەنە مەرجی سەرەکیی هاوسەرگیرییان، تاوەکوو بەختەوەری لە دونیا و ڕەزامەندیی خودا مسۆگەر بکەن.
- بەو هاوسەرە ئیماندارانەی ئاواتی منداڵێکی ساڵح و پاک دەخوازن بۆ خزمەتکردنی شەریعەت و مەنهەجی (لااله الا الله محمد رسول الله).

# پێشەکی چاپی یەکەم: مامۆستا ڕەنج شێخانی

پاش سپاس و ستایش بۆ خودای پاک و بەرز و بێهاوتا، سەڵات و سەلامی خودای گەورە لەسەر پێغەمبەری ئازیز و خۆشەویستمان ﴿ﷺ﴾ و یار و یاوەرانی تا ڕۆژی دوایی.

ڕاستییەکەی کاتێک دەبینم کاکە "عبدالله" بەو دڵسۆزییەی لە خەمی برا و خوشکە ئیمانییەکانیدایە، کە بەردەوام بێ ماندووبوون بە بابەت و نووسینەکانی پەنجە دەخاتە سەر کێشە و نارەحەتییەکانی گەنجان و لاوان لە کوڕان و کچان؛ هۆکار و چارەسەری شەرعییانەشی لەگەڵدا باس دەکات، جێگەی خۆیەتی کەوا پشتگیری لەم برا دڵسۆزەمان بکرێت لە ڕووی ماددی و مەعنەوییەوە، لەبەر ئەو ئەرکە قورسەی کە خستوویەتییە سەرشانی لە کاتێکدا خۆی زیاتر لە هەموو کەسێک پێویستی بە هاوسەرگیرییە، هەربۆیە کاتێک پێداچوونەوەم بەم پەرتووکە نایاب و شەرعییەدا کرد، زیاتر گەیشتمە ئەو بڕوایەی کەوا خوشکانێکی زۆر لەنێو میحنەت و نارەحەتیدا ژیان بەسەر دەبەن و پێویست بوو کەوا پەرتووکێکی لەم شێوەیە بنووسرێت، هەم بۆ بەئاگاهێنانەوەی ئەو ئافرەتانەی کەوا بە هۆکارێک پرۆسەی هاوسەرگیرییان دوا دەخەن، کە پێش ئەوان تاقی کراوەتەوە و لە زەرەر و پەشیمانی زیاتر بۆ خاوەنەکەی هیچی لێ سەوز نەبووە و، ئامۆژگارییەکی زێڕینیشە بۆ خوشکانی سەنگین، بەڕەوشت و بەئیمان، کە چۆن هاوسەری داهاتوویان هەڵبژێرن تا بەختەوەریان بکەن و، زەنگێکی وریاکەرەوەشە بۆ ئەو دایک و باوک و

کەسوکارەی کە بوونەتە ڕێگر لەبەردەم پرۆسەی هاوسەرگیریی کچەکانیاندا بە کەسانی خاوەن ئیمان و بەڕەوشت.

هیوادارم خوشکانی بەڕێزم بە چاوی دڵ ئەم پەرتووکە بخوێننەوە، تاوەکوو سەرجەم ئامۆژگاری و بابەتەکانی ببێتە چرایەکی ڕۆشن لەبەردەم ئەو خوشکانەی کە تازە پێ دەگەن و سوود و پەند لە ئەزموونی ئەو خوشکە بەڕێزانەش وەربگرن، کە بە هۆکارێک ژیانی هاوسەرگیرییان دوا خستووە و بە پێچەوانەشەوە گوێڕایەڵی ئامۆژگارییە بەسوودەکانی ناوی بکەن، تاوەکوو نەوەیەکی دیندار و یەکخواپەرست لەباوەشیاندا گۆش و پەروەردە بکرێت بە پشتیوانی خودای گەورە.

داواکارم لە خودای پاک و بەرز و بێهاوتا پاداشتی خێری کاکە "عبدالله" بداتەوە، بۆ نووسینی ئەم بابەتە گرنگە و زیاتر لە زانستی خۆیی پێ ببەخشێت بە نیەتێکی پاکەوە بۆ خزمەتی دینەکەی، هەروەها دەرگای خێر و خۆشیش لە سەرجەم خوشکان و برایانی ئیمانیمان بکاتەوە، ئەوانەی کە هاوسەرگیرییان دواکەوتووە یان بەنیازی هاوسەرگیرین، کەسانی چاک و دیندار و بەڕەوشت بکاتە نسیبیان و، لەژێر سایە و سێبەری یەکدا بیانحەسێنێتەوە و ڕزگاریان بکات لە ژیانی تەنیایی.

ڕەنج شێخانی

١٣ ی جەمادی یەکەم، ١٤٤٢

٢٨ /١٢/ ٢٠٢٠

دووشەممە

# پێشەكی چاپی دووەم: مامۆستا ڕەنج شێخانی

سوپاسی الله سبحانه وتعالى دەكەم كەدەبینم بۆ جاری دووەم چاپكردنەوەی ئەم پەرتوكە نایابەی كاكە عبدالله خاكی بەڕێزو خۆشەویست داخوازی برایان و خوشكانی لەسەرە، دیارە لەفەزڵی الله بەزیاد بێت كە نیشانەی نیاز پاكی و دڵسۆزی ئەو برا بەڕێزەمان دەردەخات، پاش چاوپێخشاندنەوە و پێداچونەوەی بۆ جاری دووەم، وەك ئەوە وابوو كەیەكەم جار بێت بیخوێنمەوە چونكە ناوەڕۆكی كتێبەكە خوێنەر پەلكێش دەكات بۆ سەرجەم ئەو واقیعە تاڵەی ژیانی زۆرێك لە ئافرەتان كەبەسەختی تێپەڕدەبێت بەسەریان دا. هیوادارم كەوا خوشكانی بەڕێز بەگرنگی یەوە لەكتێبەكە بڕوانن و سەرجەم ئامۆژگاری و باسەكانی بكەن بەئەڵقەیەك لەگوێیان داو كاری جددی لەسەر بكەن بۆئەوەی ئەوانیش ژیانیان وەك ئەو ئافرەتانەی لێ نەیەت كەبۆ پەندو ئامۆژگاری باسی لێوە دەكرێت. داواكارم لە الله سبحانه وتعالى پاداشتی خێری كاكە عبدالله بداتەوەو نمونەیان زیاد بكات و ژیانی خێزانداریشی بۆ ئاسان بكات و ئافرەتێكی خاوەن ئیمانی بەڕەوشت بخاتە ژێر سایەو سێبەریەوە، ئەگەرچی تائیستا بۆ خۆشی ژیانی هاوسەرگیری پێك نەهێناوە بەڵام وەك كەسێكی پسپۆڕو شارەزا لەكێشە خێزانیەكان دەردەكەوێت و لەڕێی نوسین و بابەتەكانیەوە كاریگەری لەسەر چینی گەنجان دروست كردووە سوپاس بۆ خوا.

ڕەنج شێخانی

٢٥ ی شەوالی ١٤٤٢ی كۆچی

٦.٦.٢٠٢١ ی زاینی

# پێشەکی نووسەر: چاپی یەکەم

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على خاتم الأنبياء والمرسلين المبعوث رحمة للعالمين محمد ﴿ﷺ﴾ وعلى آله وصحبه أجمعين.

هەموو سپاس و ستایشێک بۆ خودای گەورە کە نیعمەتی خۆی بەسەردا ڕشتووینە و کردووینەتی بە موسڵمان و ئیمانی پێ بەخشیووین، کە وای لێ کردووینە تەنیا بەندەی ئەو بین و بۆ ڕەزامەندیی ئەو لەم ژیانەی دونیا تێ بکۆشین، بەڕاستی خۆمان بەشایانی ئەوە نازانین لە بابەتێکی ئاوا گەورە و گرنگ بنووسین، چونکە بابەتی ئاوا گرنگ و هەستیار پێویستی بە کەسێکە لەسەری بنووسێ لە زانستی شەرعیدا ڕۆچووبێ و، تەمەنێکی زۆری بەڕێ کردبێ و ئەزموونگەلێکی دیبێ لە ژیانی دونیادا، بۆ ئەوەی لەسەر بابەتێکی ئاوا بنووسێت، بەڵام نیعمەتی ئیمان و ئیسلام کە خودا بیبەخشێ بە هەر بەندەیەکی لە هەر ئاستێك بێ، بەربەستە سەخت و دژوارەکان دەبڕێت و دەیگەینێتە ئامانجەکان؛ بەندەش، ئەزموون و دونیادیدەیەکی ئەوتۆم نییە لە ژیان بە هۆی کەم تەمەنیەوە کە بینووسین، بەڵام سپاس بۆ خودا لە فەزڵ و بەخششەکانی وای لێ کردووینە دەست بە ئیسلامەکەیەوە بگرین و شوێن ڕێباز و ئامۆژگارییەکانی پێیغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ بکەوین و، هەرچییەک لە ئامۆژگاری و ڕێنوێنییە پیرۆزەکانی فێربووینە بە فەزڵی خودا بیکەینە نووسین، تاوەکوو سوودی هەبێت بۆ بەندەکانی خودای گەورە، بەڕاستی پڕۆگرامی ئیسلام بۆ مرۆڤایەتی و تەواوی دروستکراوەکان گەورەترین نیعمەت و بەخششە لە دونیا و دواڕۆژدا بۆ خۆشی و بەختەوەرییان.

بە ئیزنی خودا هەوڵمان داوە لەم كتێبەدا خەڵكی بگەڕێنینەوە بۆ پێبەندبوونیان بە شەریعەتی خودای گەورە كە قورئان و سوننەتەكانی پێغەمبەری ئازیزە ﴿ﷺ﴾ لە پرۆگرام و یاسا جوانەكەی خودای گەورە هیچ شتێك و كێشەیەك نەماوە چارەسەر و خراپییەكانی بۆ ڕوون نەكردبینەوە.

﴿مَّا فَرَّطۡنَا فِي ٱلۡكِتَٰبِ مِن شَيۡءٍ﴾ [1] واتە: ئێمە لەم كتێبەدا كەمتەرخەمیمان نەكردووە و هیچ شتێكمان بەجێ نەهێشتووە تۆمار نەكرابێت.

بەڵێ، خودای گەورە هەر لە یەكەم ڕۆژی لەدایكبوونی منداڵ تاوەكوو مردنی و دفن و كفنكردن و ناشتنی لە گۆڕ گشتی لە شەریعەت و بەرنامەكەی بۆ پێغەمبەری ئازیز﴿ﷺ﴾ ڕوون كردووەتەوە و، ئەویش پێی گەیاندووینە، لە بچووكترین شت تا گەورەترین هەمووی بۆ شی كردووینەتەوە، تاوەكوو ڕێگە ڕاستەقینەكەی بگرینە بەر و گومڕا و سەر لێشێواو نەبین.

﴿فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ﴾ [2] واتە: ئەگەر لە هەر شتێكدا بوو بە كێشەتان، ئەوا ئەو كێشەیە بگەڕێننەوە بۆ لای حوكمی خودای گەورە پاشان پێغەمبەرەكەی ﴿ﷺ﴾–كە "قورئان و سوننەت" دەگەیەنێت.

بەڵام بە داخەوە خەڵكی ئێستا چاكەی ئیسلامیان ناوێ و ڕابواردنی كەم و كاتی دونیایان دەوێت، دوای ڕێباز و ڕێگەی مرۆڤە گومڕاكان كەوتوون؛ لەم كتێبەدا گشت چارەسەرییەكانمان گەڕاندووەتەوە بۆ ئیسلام و ئاوێكی سازگار لە كانیاوی پاكی ئیمان بە كێشەكاندا دەكەین و چارەسەرێكی تەواو بۆ گشت

[1] - سوورەتی الانعام، ئایەتی (٣٨).

[2] - سوورەتی النساء، ئایەتی (٥٩).

کێشەکانی تایبەت بە (دڵەڕاوکێ کچان، هۆکاری مانەوەیان بە قەیرەیی، ڕێگرییەکانی باوک و برایان لە شووکردنی کچ لەوەی بە دڵی خۆی هاوسەری هەڵبژێرێت، ڕێنمایی بۆ خوشکان چی بکەن و چۆن بەرانبەر ماڵەوەیان داوای مافی خۆیان بکەن، بەختەوەری هاوسەران لە چیدایە، ئامۆژگاری و ڕێنمایی بۆ ئەو خوشکانەی ماونەتەوە و شوویان نەکردووە و وەسیەت و ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەری ئازیز ﷺ بۆ خۆشبەختیی هاوسەران و چەندان بابەتی تری بەسوود) لەم کتێبە بەکورتی و پوختی باس کراوە.

داواکارم لە خودای گەورە ئەم ماندووبوونەی چێشتوومانە لە نووسینی ئەم کتێبە و تەواوی کردەوەکانمان لێ قەبووڵ بکات، کە تەنیا بۆ ڕەزامەندیی خۆی بێت، هیچ ماندووبوون و کارێکمان بۆ جگە لەو نەبێت، و بەردەوامیمان پێ ببەخشێ لەسەر ڕێبازی پیرۆزی تەوحید.

**اللَّهُمْ اجْعَلْ عَمَلِي كُلَّهُ صَالِحَاً وَاجْعَلْهُ لِوَجْهِک خَالِصَاً وَلا تَجْعَلْ أَحَدٍ فِيهِ شَيْئَاً**

بەندەی هەردەم پێویست بە خودای گەورە: عبدالله خاکی.

١١ی سەفەری ١٤٤٢

شەوی دووشەممە ٢٠٢٠/٩/٢٨

کات: ٨:٥٠ خولەکی شەو

# پێشەکی نووسەر: چاپی دووەم

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على خاتم الأنبياء والمرسلين المبعوث رحمة للعالمين محمد ﴿ﷺ﴾ وعلى آله وصحبه أجمعين.

سەرەتا بیرم لەوە نەئەکردەوە کە چاپی دووەمی ئەم کتێبە بکەین، بەڵام بە هۆی زۆری داوای خوێنەران، کە داوای کتێبەکەیان ئەکرد چاپ بکرێتەوە، بەهۆی نەمانی چاپی یەکەم، دوای بڵاوبونەوەی لە زۆربەی شارەکان ناردنی دەستخۆشی و دوعای خێر کە سوودیان لێ بینیوە، هەستمان کرد سوودی هەبووە بۆ هەندێک کەس.

بۆیە بڕیارماندا بە ئیزنی الله دووبارە چاپ بکرێتەوە، لەم چاپەدا بە ووردی پێداچوینەتەوە و هەر کەم و کورتی و تێبینی هەبووە دەستکاریمان کردووە و پاشان چەند بابەتێکمان بۆ زیاد کردووە، بەویستی خوا سوودی زیاتری دەبێت لە چاپی یەکەم ، بەس بەڕاستی ئەگەر لە پێناو الله، پاشان لە خەمی ئیسلامەکەمان نەبێ پێمان خۆشنەبوو هیچ ئامۆژگاریەک بنووسین بۆ کچان، ئەگەر بڵێین هەندێک لە کچان شایەنی پیاوی زاڵم و دڵ ڕەق و خراپن، و حەق وایە بچەوسێنرێنەوە و وەکو کۆیلەیەک مامەلەیان لەگەڵ بکرێت، تاکو قەدری عافیەت بزانن، ئەوە بەس نیە چونکە زۆرینەی کچەکان سبحان الله ساویلکە و خۆشباوەڕی زاڵە بەسەریان وا تێگەیشتوونە کەشوویان کرد بە کوڕی قۆز و کەشخە ئیتر تەواو ئەچنە بەهەشتەوە، بێئاگا لەوەی ژیانی سەدان کچ بۆتە دۆزەخ بەهۆکاری ساویلکەی و خۆشباوەڕیان زوو هەڵخەلەتان، بۆیە مەگەر تەنها الله ڕەحمی بە هەندێ کردبێ ژیرانە

بیربکەنەوە و بڕیارێکی ژیرانە بدەن، ئەگەرنا زۆریان هەرچەند بڵێت ئەمە باشە و ئەمە خراپە بەهیچ شێوەیەک کارناکاتە سەریان و ئامۆژگاری وەرناگرن، هەر بە دڵی خۆیان ئەکەن، تا لەکۆتایی توشی ماڵ وێرانی و پیاوی خراپ و نەگبەت دەبنەوە، ئەم قسانەش بێ بەڵگە نین و دەیان نموونەیان بۆ باسکردووین و زانیومانە، خەمێکی تر و هۆکارێکی تر لە نووسین و بڵاوکردنەوەی داروخانی کۆمەڵگایە، کوفر دەیەوێت خێزانی موسڵمان لەیەک بکا و تووشی جیابونەوەیان بکا، تا بێ ڕەوشتی، داوێن پیسی، و زینا زۆربێ دەیان ڕێگا و وەسائیل گرتۆتە بەر، لە ڕێگای تیڤی و سۆشیال میدیا و فیلمە دۆبلاژکراوەکان، کە ئەمەش ڕێگایەکە بۆ فیتنە و زۆربونی تاوان و دوورکەوتنەوەی خەڵکی لە ئیسلام، بۆیە ئامانج و ئاواتمان گەڕانەوەی خەڵکیە بۆ ئیسلام و دەستگرتن بە بەرنامەی الله تاکو خۆشبەختی و کامەرانی بگەڕێتەوە بۆ نێو مرۆڤایەتی، لەم کتێبەدا زۆربەی کیشەکان و چارەسەریەکانمان باسکردووە و خوێنەر پەڵەکێش دەکات بۆ داننان بە ڕاستی و حەقیقەت، و تەسلیم بوون بۆ ڕاستیەکان گەر تاڵیش بێت و بەجۆرێک دەستەوسانی دەکات بەرامبەر ڕاستیەکان..

براتان: عبدالله خاكى

# بۆچی ئەم كتێبەمان نووسی؟

برا و خوشكانی گەنج و لاوی دڵسۆزی ئیسلامەكەم، ڕەحمەتتان لێ بێت بزانن، كە تاكە مەبەستمان لە نووسینی ئەم كتێبە تەنیا ڕەزامەندیی خودای گەورە و، پاشانیش سوودمەندبوون و بەختەوەریی چینی گەنجانە، بەتایبەت ئەوانەی نەچوونەتە ژیانی هاوسەرێتی و بەتایبەتتریش خوشكان، چونكە زەرەرمەندی یەكەم تەنیا ئافرەتانن، كە دەبنە قوربانیی چینی كۆمەڵگە، كوڕان زۆر بەئاسایی و بێخەمی زۆربەی بەربەستەكانی ژیانیان تێدەپەڕێنن؛ پیاو هەیە تەڵاقدان ئەوەندە لای ئاسانە، وەكوو ئاوخواردنەوە وایە، كەسیش پێی ناڵێت: "لەپشت چاوت دوو برۆیە".

بەڵام كچ لە كۆمەڵگە وەكوو كوڕ نییە، ئەگەر یەك جار شووی كرد و تەڵاق درا ئاستی دادەبەزێت و بە چاوی كەم سەیر دەكرێت و، لە نێو خەڵكی بڵاودەبێتەوە كە فلان ئافرەت تەڵاق دراوە و بۆتە بێوەژن، دواڕۆژی دەفەوتێت، بە وێنەی شووشە، ئەگەر یەك جار شكا دووبارە چاكبوونەوەی مەحاڵە و، وەكوو خۆی لێ نایەتەوە، كە تۆش تەڵاق درای، وەكوو سەرەتای كچێتی نرخت لای خەڵكی نابێ و دەبیتە قوربانیی حەز و ئارەزووی خەڵكە نەزان و جاهیلەكە.

بۆیە وەكوو برایەكی دڵسۆز و خەمخۆری گشت خوشكانی ئیماندار لە هەر كوێیەكدا هەن دەستمان دایە نووسینی ئەم چەند ئامۆژگارییە بە هیوای ئەوەی بگاتە زۆربەی خوشكانی ئیماندار لەژێر ڕۆشنایی فەرموودەی:

﴿مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ وَتَرَاحُمِهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ مَثَلُ الْجَسَدِ، إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بِالسَّهَرِ وَالْحُمَّى﴾[١]. واتە: نموونەی ئیمانداران لەنێو خۆیاندا و لە بەزەیی پێداهاتنەوەیان بە یەكتری و لە یەكتر خۆشویستنیان و لە هاوسۆزیيان بەرانبەر بە یەكتری، وەكوو یەک جەستەن، كە ئەندامێكی ئازاری هەبێت، هەر هەموو ئەندامانی تری جەستەكە تایان لێ دێت و شەونخوونی بۆ دەكێشن.

بۆیە ئێمەومانان، كاتێک هەواڵی ئازار و میحنەتی موسڵمانێک دەبیستین، كە فلان ئافرەت پیاوەكەی لەگەڵی خراپە و ڕێزی ناگرێ، فلان بە هۆی پیاوەكەیەوە شەش مانگە تۆراوە و چووەتەوە ماڵی باوكی، فلان ئافرەت لەلای خەڵک پیاوەكەی گاڵتەی پێ دەكات و ڕێزی ناگرێت، فلان ئافرەت بە هۆی ڕەزیلی و گرنگیپێنەدانی پیاوەكەیەوە بەردەوام شەڕ و دەمەقاڵێیەتی، بۆیە بێتاقەت و دڵتەنگ دەبین، ئازارەكانی ناخمان بە نووسین بۆیان هەڵدەڕێژین و دەریدەبڕین لەپێناو ڕەزامەندیی خودا، پاشان خۆشبەختیی ئیمانداران، پێمان خۆشە ژیانی گشت موسڵمانێک لەوپەڕی خۆشی و ئاسوودەییدا بێت.

هیوادارم ئەم ئامۆژگارییە وانە و پەند بێت بۆ خوشكانم، بەتایبەت ئەوانەی هێشتا نەچوونەتە ژیانی هاوسەرێتی و، گەنجن و تاڵی و ئازاری ژیانیان نەچێشتووە، ژیانیان وەكوو خوشكانێک لێ نەهێت، كە لەبەر پیاوی خراپ خۆشیی دونیایان فەوتاوە؛ چونكە ژیانی هاوسەرێتی یەک جارە و تا مردنە، نەك گاڵتە و یاری بێت و، بڵێت: 'با جارێک تاقی بكەمەوە و بزانم چۆنە'.

---

[١] - البخاري ،الأدب، ژمارەی فەرمووده (٥٦٦٥).

بۆیە لەم چەند ئامۆژگارییەی نووسیومانە پەند و وانەی زۆر بەسوودی تێدایە بۆ کەسێک کە بەدوای بەختەوەری و ئاسوودەییەوەیە لە ژیانی دونیادا و، مەبەستی ژیانێک بێ کە لەگەڵ پیاوەکەی بۆ قیامەت و بەهەشتی نەبڕاوە تێ بکۆشن.

پاشان بە ئیزنی خودا چارەسەر دەدۆزینەوە بۆ نەخۆشییەک کە لەنێوان خوشکانێک بڵاوبووەتەوە، ئەگەر نەچنە لای دکتۆر تیماری برینی نەخۆشییەکەیان نەکەن و خەمێک لە خۆیان نەخۆن، تووشی خەم و خەفەتێکی کوشندە دەبن، بە نموونەی نەخۆشیی شێرپەنجە کە لە داهاتوودا تەواوی ژیانیان بەخەم و خەفەت دەکوژن و خۆیان بە خەم و ئازاری ناخیان لەنێو دەبەن.

بە هیوای ئەوەی کە ئەم نووسینە چارەسەر بێت بۆ نەخۆشییەکەیان و تیمارکەری دەردەکانیان بێت بە ئیزنی خودای گەورە، کە برینی نەخۆشییەکەیان قەلەقی و ڕاڕاییە تووشیان بووە، کاتێک خوازبێنییان دێت بۆ هاوسەرگیری، بە هۆی دوورکەوتنەوەی خەڵکی لە ئیسلام کێشەکان ڕۆژبەڕۆژ ڕووی لە زیادبوونە، چاک و خراپ لە یەکتری جیا ناکەنەوە.

بۆیە داواکارم تەنیا بە چاوی سەر نەیخوێننەوە بەڵکوو بە گوێی دڵ و ئەقڵ بیخوێننەوە و ئامۆژگارییەکان لە مێشک و زەینیان هەڵبگرن، لە ژیانیان بیهێننە دی لەپێناو خۆشبەختیی خۆیان لە دونیا و دواڕۆژدا.

پاشان من، سپاس بۆ خودا هیچ کێشەیەکم لە ژنهێنان و ئەو باسانەدا نییە، پێم خۆش بوو خودا ویستی لێ بووبایە، تا دوای هاوسەرگیری ئەم بابەتانەم نووسیبا، بۆ ئەوەی کەس گومان نەکات کە من کێشەیەکی کەسیم هەبووبێ، یان ڕقوکینەیەکم لە دڵدا بووبێت، بۆیە نووسیبێتم، هەروەکوو لە سەرەتاوە باسم کرد کە لە خەمخۆریی خۆم بۆ ئیسلام و موسڵمان دەستم داوەتە نووسین، کە لەم ڕێگەیەوە خزمەت بە ئیسلام و موسڵمانان بکەم، بۆیە هەرچی باسم کردووە، یان بیستوومە، یان بە چاوی خۆم بینیوومە، لەبەر ئەوە هیچ باسوخواسێکی ناو ئەم کتێبە بێ بەڵگە نییە، بۆیە ئێمە کە ئیمانداریـن دەبێت چیمان بۆ خۆمان پێ خۆشە لە خۆشی و نیعمەتەکانی دونیا زیاترمان بۆ برا و خوشکانی ئیماندار پێ خۆشتر بێت، ئێمە کە لە نەبوونی و کەمدەستیدااینە، بە پێچەوانەوە ئاواتەخوازین هەموو ئیمانداران تێر و دەوڵەمەند و ژیانی گشت هاوسەران بەختەوەر بێت؛ ئێمە کە کێشە و ناخۆشییەکمان هەیە، پێمان خۆشە بەس ئێمە لەو کێشە و ناخۆشییەدا بین، ئیمانداران لە خۆشی و بێکێشەییدا بن، بۆیە کە ئەم کتێبەم نووسیووە، تاکە ئامانجم لێی هۆشیارکردنەوە و بەئاگاهێنانەوەی چینی گەنجانی موسڵمانە، تاوەکوو چاوکراوە و بەئاگا بن و هەریەکێک لەوان سەرباز ئاسا بۆ ئیسلامەکەی گیان لەسەر دەست بێت و، ببێتە پاسەوان و دڵسۆزانە بۆ دینەکەی تێ بکۆشێت، چونکە ژیانی پڕ لە خۆشی لە دونیادا تەنیا و تەنیا بەس لەنێو بازنەی ئیسلامدایە.

**﴿قال الفضيل بن عياض (رحمه الله) الحَياة الطيّبة هي الإسلام والسُّنه﴾.**[1] واتە: فضیل کوڕی عیاض (ڕەحمەتی خودای گەورەی لێ بێت) دەفەرمووێت: ژیانی خۆش و بەختەوەر واتە ئیسلام و سوننەت.

ئەم دونیایە بێ بەرنامە و یاسا دروست نەبووە، زۆر بەرنامە و یاسا هەن، هەرچی بەرنامەش هەیە گشتی بەتاڵ و پوچە، لە هێنانەدێی خۆشی و ئاسوودەیی بۆ مرۆڤ، تەنیا بۆ تێرکردنی ئارەزووە خراپەکانیان دروست بوونە، ئەگەر بێت و بگەڕێین بەدوای ژیانی خۆش و بەختەوەر هیچ یاسایەک نییە بە ئەندازەی ئیسلام، خۆشبەختی بۆ مرۆڤ دەستەبەر بکات، بۆچی ئێستا ژیان ئاوا پەشێوە و ئاوا پڕە لە میحنەت و ئازار و برسیەتی و کوشتن، چونکە یاسای دەستکردی حەز و ئارەزووی مرۆڤی گومڕا و یاخی لە بەرنامەی خودای گەورە جێبەجێ دەکرێ و، بووەتە پڕۆگرامی مرۆڤایەتی لە ئێستا، بەڵام کاتێک یاسای ئیسلام لە حوکم و حوکمداری بوو خۆشبەختی و خۆشی بۆ مرۆڤایەتی دەستەبەر کردبوو، کەوایە بە غەیری ئیسلام و دەستگرتن بە سوننەت و ئاکاری پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ بەختەوەری و خۆشی لەم دونیایە بوونی نییە و نابێت، بەبێ ئیسلام دونیا دۆزەخێکی ساردوسڕ و بیابانێکی تەخت و وشکە، بۆیە تەنیا بەرنامەی ئیسلام و بەس، ئیسلام و، بەس ئیسلام. ئەمە ئامانج و مەبەستی ئێمە بوو بەکورتی لە نووسینی ئەم کتێبە و بڵاوکردنەوەی، خودای گەورە ڕەحم بە حاڵی هەموو موسڵمانێک بکات لە هەر کوێیەکی ئەم دونیایەدان، لە دوارۆژیش بەهەشتی فیردەوس بکاتە پاداشتمان.

[1] - بڕوانە: ذمّ الكَلام، ص'٢٣٧.

# هۆی دڵەڕاوکێی کچان لە هاوسەرگیری و چارەسەری

دڵەڕاوکێ و ڕاڕایی، بریتییە لەوەی کاتێک ئێمە هەست بکەین کە دوودڵ و دڵەڕاوکێین و ترسمان هەیە سەبارەت بە شتانێک کە لە ئان و ساتدایە ڕوو بدەن یان دەکرێ لە داهاتوودا ڕوو بدەن.

کاتێک دەکەوینە ژێر کاریگەریی ترسێکەوە، ئینجا ئەو ترسە بە هۆی بیرکردنەوەوە بێت یان بە هۆی هەستەکانمانەوە بێت یان هەر هۆکار و ڕووداوێکی تری ژیان، بۆیە هەموو کوڕ و کچێک کاتێک کاتی هاوسەرگیرییان دێت، هەستێکیان هەیە کە لە ناخەوە هەست بە ناخۆشی، ترس و دوودڵی دەکەن، لەوەی ئەو کەسەی دێتە ژیانیان کەسێکی خراپ و بێهەست بێ، زماندرێژ بێ، ناشرین بێ، زاڵم و دڵڕەق و بێڕەحم بێ ئەمانە و دەیان ترس و دوودڵی تر ڕوو لە گەنجەکان دەکەن.

مرۆڤی ئیماندار پێش هەموو شتێك دەبێت خاوەن قەناعەت بێت و زۆر جیاواز بێت لە کەسانی جاهیل و نەزان و دوور لە ئیسلام و هەر کاتێک لە ژیان شتێکی لەدەست دا یان پێی بەخشرا سپاسگوزاری خودا بێت، گەر کاتێکیش شتێکی ناخۆش لە ژیانی ڕۆژانەی ڕوو بدات، دەڵێت: ﴿الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾[1] واتە: ئەوانەی هەر کاتێک تووشی بەڵاو ناخۆشییەک دەبن، دەڵێن: "ئێمە موڵکی خوداین و هەرچی

[1] - بروانە: سورەتی البقرة، ئایەتی (١٥٦).

هەمانە بەخششی خودایە، سەرەنجامی گەڕانەوەشمان تەنیا هەر بۆ لای ئەو زاتەیە."

بەڵێ، بەڕاستی ئەم جۆرە ئیماندارانە بەندەی دڵسۆزی خودای گەورەن، هەر شتێک ڕوو دەدات لە خۆشی، ناخۆشی، خەم و ئازار لە ژیانیاندا نائومێد نابن لە بەزەیی خودا، هەمیشە بە ئومێد و هیواوە دەژین، ڕێگە و ڕێبازی خودای گەورە کە ئیسلامە لە دونیا بە هیچ شتێک ناگۆڕنەوە، ئەگەرچی هەموو خۆشیی و نازو نیعمەتی دونیا لەدەست بدەن، بۆیە خودای گەورە، لە بارەی ئەم ئیماندارە ڕاستگۆیانە دەفەرموویت: ﴿أُولَٰئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ﴾[١]. واتە: ئا ئەوانە چەندان ستایش، ڕەحمەت و میهرەبانی بەسەریاندا دەبارێت لەلایەن پەروەردگاریانەوە و، ئەوانە ئەو کەسانەن بەڕاستی ڕێبازی هیدایەتیان وەرگرتووە.

بۆیە گرنگترین شت بۆ ئێمەی گەنجان، کە دەچینە ژیانی هاوسەرێتی، قەناعەتە؛ هەرچی خودا دەیکاتە نسیب و قسمەتمان، لە ماڵی دونیا، لە جوانی، هێز، دەوڵەمەندی و هەژاری هەر چۆنێک بێت، دەبێت سپاسگوزاری خودای گەورە بین، دەبێ ئەوەش بزانین ژیانی هاوسەرێتی قەناعەتە، نەک تەنیا تێرکردنی حەز و ئارەزووەکانمان.

تۆی کچ کە شوو دەکەیت دەبێ قەناعەت بکەی بە نانی ڕەق و بە نەبوونی، دەبێ بزانیت تۆ ئەو کات خاوەن ماڵێکیت جیاواز لە ماڵی باوکت، دەبێ زۆر شت بگۆڕیت و زۆر شت قەبووڵ بکەیت، ئەگەر وا نەکەیت، ئەوا تەمەنی هاوسەریت کورت دەبێت، تەنیا ئاهەنگی مارەبڕین و گواستنەوە،

---

[١] - سورەتی البقرة، ئایەتی (١٥٧).

خۆشییەکان، گرتنی وێنەی سناپ و خۆبەساقەکردن مەبینە، دەبێ لێبوردەیی، میهرەبانی و ئارامیت زۆر زیاتر بکەیت، چونکە تۆ دەبیت بە دایک گەورەتر دەبیت و ئەرک و بەرپرسیارێتیت دەکەوێتە سەرشان، بەرگەی سەرما لە نەبوونی نەوت و، بەرگەی بێ کارەبایی بگری؛ تۆ لە ماڵێکی گەورە دەچیتە ماڵێکی بچووکی خۆت، ڕەنگە ژوورێک بێت نە قەنەفە و نە تەلەفزیۆنی گەورەی لێ بێت، دەچیتەوە خاڵی سەرەتا و لەوێوە بناغەی ماڵێکی نوێ و ژیانێکی نوێ بۆ خۆت دروست دەکەیت لەگەڵ ئەو کەسەی هەڵتبژاردووە!

ئەگەر تۆ تەنیا ئەڵقە، زێڕ، جل و ماڵت مەبەستە لە شووکردن، ئەوا ماڵی باوکت خۆشترین و باشترین شوێنە نە ژیانی کەس تێک دەدەیت و نە یاری بە ژیانی خۆشت دەکەیت!

هەڵبەت بۆ کوڕیش هەمان شتە، بەڵام بە بەرپرسیارێتیی زیاتر و ئارامگرتنی زیاتر بۆ کوڕە، کوڕ کە هاوسەرگیری دەکات، دەبێتە بەرپرس و گەورەی خێزان، ئەگەر توانای وەرگرتنی ئەو ئەرک و بەرپرسیارێتییەت نییە، ئەی براکەم، نابێ خۆت بخەیتە ژێر باری کارێک کە لە تواناتدا نەبێت، بۆیە هاوسەرگیری پێش ئەوەی چێژ و خۆشی بێت، پێش ئەوەی پڕکردنەوەی بۆشاییەک بێت، بەرپرسیارێتی و قوربانیدانە، دەستپێکردنەوەیە لە خاڵی سفرەوە، ڕۆیشتنە بەرەو ژیانێکی نوێ و جیاوازتر لە ژیانی ماڵی باوکت.

بۆیە بزانن، کێ دەکەن بە هاوسەری ژیانتان، چونکە بەڕاستی وەکوو گوتمان ژیانی هاوسەرێتی پڕە لە قوربانیدان، ئەرك، ماف و ماندووبوون.

هەروەها ئەم ژیانەی دونیا بەهەشت نییە، بێخەم لێی پاڵ بدەینەوە هەر وا بزانین تەنیا خۆشی و ڕابواردنە.

نەخێر، بەڵکوو پڕە لە خەم، ئازار، دڵشکان، ماندووبوون، گریان، نەخۆش دەبیت و ئازار دەکێشی، بۆیە مرۆڤ لەم ژیانەی دونیادا پێویستی بە کەسێکە هاوخەمی بێت، هەروەکوو چۆن ئەگەر تۆ ڕێبوار بیت و بەرەو شوێنێکی دوور ڕێ بکەیت، چەند ناخۆشە بەتەنیا ڕێبوار بیت، لەم ڕێگە دوورە کەسێک نەبێ دڵنەوایت بکا، خەم و ئازارت لەسەر سووک بکات، پشتت بێت و کاتی ماندووبوونت بارەکەت لەگەڵ هەڵبگرێت و، خۆشی و ناخۆشیت لەگەڵ بەش بکات، ئەی ئەگەر هاوسەفەرێکی دڵسۆز و پاکت لەگەڵدا بێ، لە ڕێگە هاودەرد و هاوخەمی یەکتر بن، لابەری خەم، ئازار، خۆشی و ناخۆشی یەکتر بن، هیوابەخشی و گەشبینیت پێ بدات، چەند خۆشە ئەو کات هەست بە ماندوویی، ناخۆشی و سەختی ڕێگەکە ناکەیت، دەبیتە دڵخۆشترین و بەختەوەرترین مرۆڤ.

بۆیە لە ژیانی دونیادا باوك، دایك، برا، خوشک و خزمەکانت دەمرن، تۆ بۆیان دڵشکاو و دڵبەخەم دەبیت، هەناوت دەبێتە پارچەیەك لە ئاگر و بە نێو لاشە و دەمارەکانت دەخولێتەوە، بیزار دەبی لە ژیان، خۆشی و هەلاو بەزمی رابردووت لە بیر دەباتەوە و سینەو سینگت تەنگ دەبێ، هەناسەت بۆ نادرێت، بۆیە ئەگەر کەسێکی دڵسۆز و بۆ خودا سوڵحاوت هەبێت لە ژیاندا؛ دڵت خۆش بکات، کاتێک لە ناخۆشی، خەم و ئازاردای لابەری خەمەکانت بێت، هانت بدات بۆ ئەوەی لە ژیان بۆ خودا و ڕەزامەندیی خودا بژییت، گرنگترین کەس بی لەلای و بە هەرچی شت هەیە لە دونیا لەپاش ئیمان نەتگۆڕێتەوە، هەمیشە لێت نزیک بێت و ڕۆژانە لە خەم، ئازار و دڵتەنگیەکانت بپرسێت ئەو کات هەستێکی چەند خۆشت دەبێت؛

بەڵام ئەگەر هیچ گرنگیت پێ نەدات، گوێی لە هەست و خەمەكانت نەگرت و پشتگوێت بخات، تەنیا ئەو كاتانە تۆی لەبیر بێت، كە دەزانێ نەفسی خۆشی دەبینێ و، لەپێناو خۆشیی خۆی تۆی بێتەوە بیر، ئەو كاتە تۆ چ هەستێكت دەبێت!

بێگومان ناخۆشترین ژیانت دەبێ ئاوات بە مردن دەخوازیت، چونكە ئافرەت یەك جار دەبێت بە بووك و، زۆر گرنگە بزانێت بۆ چ كەسێك ئارامی و ئاسوودەیی ماڵی باوكی بەجێ دێڵێت، ئایا ئەو كەسە شایستەیە قوربانیی بۆ بدات یان نا، لە خۆت بپرسە، بزانە قوربانی بۆ چ گەنجێك دەدەیت!

تاكو لە داهاتوو پەنجەی پەشیمانی نەگەزیت ئاگاداربە.....!!!!

# تاكە بەرنامە بۆ بەختەوەریی هاوسەران تەنها ئیسلامە

دەبێت بزانین ئەم ژیانەی دونیا بەبێ یاسا و بێ خاوەن دروست نەكراوە، هەموو شتێک لە دونیادا خاوەنی خۆی هەیە، كوڕ و كچ (باوك، برا، مام، خاڵ و كەسوكاری خۆی) هەیە، بستێک زەوی لەسەر دونیا خاوەنی خۆی هەیە، یان مرۆڤ یان وڵاتێک خۆی كردووەتە خاوەن و بەرپرسیاری و، هەتا ئاسمانیش داگیر كراوە، بەبێ پرسی وڵاتی دراوسێ هیچ كەس بۆی نییە بە فڕۆكە بەسەر ئاسمانی وڵاتەكەیدا بسوڕێتەوە، لە دارستان هەر گیاندارە و شوێن و بەشێكی داگیر كردووە، هەر باڵندە و باڵدارێ دارێكی هەیە و خانوو و هێلانەی لەسەر دروست كردووە.

ئەگەر بێینە سەر باسی خاوەنی شتە دونیاییەكان، كۆمپیتەر، ئەنتەرنێت، مۆبایل، كاتژمێر، كارەبا، گڵۆپ، پێڵاو، جلوبەرگ، سپلیت، سەلاجە و هتد. هەرچی شتێک هەیە دروستكەر و خاوەنی خۆی هەیە، هەروەها خاوەنی هەموو شتێک و دروستكراوێكیش كێیە؟

بێگومان خودای گەورەیە ﴿اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ﴾[1]

واتە: خودا بەدیهێنەر و دروستكەری هەموو شتێكە، هەر ئەویش سەرپەرشت و پارێزەری هەموو شتێكە.

بەڵێ، بێگومان هەر خودای گەورەیە زانا و بەئاگایە لە ترپەی دڵەكان و نهێنییە شاراوەكانی مرۆڤەكان.

[1]- بڕوانە: سورەتی الزمر، ئایەتی (٦٢).

﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِ نَفْسُهُ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ﴾[١] واتە: سوێند بە خودا، بێگومان ئێمە ئادەمیزادمان دروست کردووە و، دەزانین چی بە دڵ و دەروونیدا دێت، ئێمە لە شارەگ و دەماری دڵی لێی نزیکترین.

لەم ڕۆژگارەی ئێستای پڕ لە ناخۆشی و فیتنەیەدا کە تەواوی دونیای گرتووەتەوە، هیچ بەرنامە و یاسایەک چارەسەری پێ نییە بۆ کێشەکان، جگە لە دینی ئیسلام، هەرچی خۆشی و بەختەوەری لە دونیادا بوونی هەیە، گشتی لە ئیسلامدا کۆ بووەتەوە.

بەرنامە پوچ و دەستکردەکانی تری حەز و نەفسی مرۆڤەکان هەموو بۆ تێرکردن و خۆشی و ڕابواردن دروست کراون، دژی بەرنامەی دروستکەری ئەرز و ئاسمان کە خودای گەورەیە، بۆچی ئێستا کێشەکان ڕوویان لە زیادبوونە، بەتایبەتیش کوشتن، جیابوونەوە (تەڵاق) و ئازاردانی ئافرەت ڕووی لە هەڵکشانە، هەر لەم کۆمەڵگەی خۆمان سەرۆکی بە ناو دادگا ڕاپۆرتێکی بڵاو کردووەتەوە، کە ڕۆژانە تەنیا لە کوردستان چل (٤٠) خێزان جیا دەبنەوە.[٢]

هۆکاری ئەم هەموو جیابوونەوەیەش دوورکەوتنەوەیە لە ئیسلام و بە ناوی ئازادیی مافی ئافرەت ژیانی ئافرەتیان کردە دۆزەخ. بەڵێ، هەموو شتێکیان ئاسایی کرد بۆ ئافرەت و، دەرگای بێڕەوشتییان کردەوە بە ناوی یەکسانیی ژن و پیاو؛ لەوەی کە ئافرەت وەکوو پیاو هەموو شتێکی بۆ ئاساییە، بە ئارەزووی خۆی بەیانی لە ماڵ بڕواتە دەر تا نیوەی شەو چی دەکات، با بکات.

---

[١]- بڕوانە: سورەتی ق، ئایەتی (١٦).

[٢] - بڕوانە: لینکی سەرچاوەی ڕاپۆرتەکە (https://www.rudaw.net/sorani/kurdistan/)

ئینجا ئەمانە هەمووی ڕێگە و پیلانی شەیتانە بۆ بڵاوکردنەوەی تاوان و شێواندنی ڕێگەی حەق و گومڕاکردنی مرۆڤەکان.

بۆیە پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ لە فەرموودەی پیرۆزی ئاماژەی کردووە بەوەی شەیتان لەشکرەکانی دەنێرێت بۆ تێکدانی پێوەندیی نێوان ژن و مێرد، ئێستاکەش ئەم هەموو کێشەی جیابوونەوەی نێوان هاوسەران هەر بە هۆی کارە شەیتانییەکانەوەیە، بە هۆی خیانەت و ناپاکی و یاسا دەستکردەکانی حەز و ئارەزووی ئەهلی کوفر بۆ هێنانە دەرەوەی ئافرەت بەم شێوەیە، شەیتان لە ڕێگەی نوێنەرەکانییەوە خراپەکاری و تاوان بڵاو دەکاتەوە.

﴿ عَنْ جَابِرٍ ﴿رضي الله عنه﴾ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ إِنَّ إِبْلِيسَ يَضَعُ عَرْشَهُ عَلَى الْمَاءِ، ثُمَّ يَبْعَثُ سَرَايَاهُ، فَأَدْنَاهُمْ مِنْهُ مَنْزِلَةً أَعْظَمُهُمْ فِتْنَةً، يَجِيءُ أَحَدُهُمْ فَيَقُولُ: فَعَلْتُ كَذَا وَكَذَا، فَيَقُولُ: مَا صَنَعْتَ شَيْئًا. قَالَ: ثُمَّ يَجِيءُ أَحَدُهُمْ فَيَقُولُ: مَا تَرَكْتُهُ حَتَّى فَرَّقْتُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ امْرَأَتِهِ، قَالَ: فَيُدْنِيهِ مِنْهُ وَيَقُولُ: نِعْمَ أَنْتَ -قَالَ الْأَعْمَشُ: أُرَاهُ قَالَ- فَيَلْتَزِمُهُ﴾[١]. واتە: لە جابرەوە (خودای گەورە لێی ڕازی بێت)، دەڵێ: پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: شەیتان تەختی خۆی لەسەر ئاو دادەنێت، پاشان مەفرەزەکانی بەم لا و لادا دەنێرێت، کامیان لای شەیتان پلەوپایەی لە هەموویان نزمترە و ساختەچیترە، یەکێکیان کە دێتەوە بۆ لای دەڵێت: ئەوەم کرد و ئەوەم کرد، ئەویش دەڵێت: هیچت نەکردووە. پاشان یەکێکی تریان دێت و دەڵێت: وازم لە کابرا نەهێنا تا نێوان خۆی و ژنەکەیم تێک دا، ئەوجا ئەویش لە خۆیی نزیک دەخاتەوە و، دەڵێت: ئای تۆ چەند چاکی—أعمش، دەڵێ: وا بزانم فەرمووی: (لەباوەشی دەکات).

[١] - بڕوانە: سەحیحی موسلم، ژمارەی فەرموودە (٢٨١٣).

بەڵێ، بە هەمان شێوە کوفر دەیەوێ بێڕەوشتی و بێئەخلاقی بڵاو بکاتەوە، بە ناوی ئازادییەوە ئافرەتیان لە دایکایەتیی پەروەردەکار خست و لە ماڵەوە هێنایانە دەرەوە بۆ کارکردن، لە زانکۆ و شوێنی دەوام ئافرەت و پیاویان تێکەڵ کرد، تاوەکوو کۆمەڵێک پیاوی چاوبرسی بۆ ڕابواردن حەزەکانی خۆیان بەتاڵ بکەنەوە، وەکوو ڕۆژاوا تاوەکوو کۆمەڵگە بێئەخلاق و بێڕەوشت بێت، داوێنپیسی و خۆشەویستی (عاشقایەتی) لەنێو کۆمەڵگە بڵاو بێتەوە، ببێتە شتێکی ئاسایی، هەموو وەکوو ئاژەڵ بژین، مرۆڤ وا لێ بکەن تەنیا بیری لای داوێنی و تێرکردنی نەفسی بێت، تاوەکوو بیر لەوە نەکاتەوە بۆچی هاتووەتە دونیا و، مردن و قیامەت لەبیری مرۆڤەکان ببەنەوە، بەم شێوەیە هەموو یاسایەک بۆ بەڕەڵایی و بێڕەوشتی ڕێگەپێدراوە، بۆیە خیانەت و جیابوونەوە (تەڵاق) لە کۆمەڵگە ڕووی لە زیادبوون کرد، زۆربەی ماڵەکان ئافرەتێکی بێوەژنی هەیە، کە تەڵاق دراوە لەسەر خیانەت، ناپاکی، شەرەف و بەڕەڵایی، یان لەسەر خیانەتی پیاوەکەی کە پێوەندیی ناشەرعی لەگەڵ ئافرەتی تر هەبووە.

بە ناو زانا و نووسەرە بێباوەڕەکانی ڕۆژاوا، دانیان بەم ڕاستییە ناوە، کە هێنانە دەرەوەی ئافرەت لە ماڵەوە بۆ کارپێکردن لە شوێنە گشتییەکان نەهامەتی و کێشە و جیابوونەوە بۆ خێزان دروست دەکات.

"إیدا أولین" کە پزیشکێکی ئافرەتی ئەمریکییە، دەڵێ: "هۆی کێشەکان و تێکچوونی خێزان لە ئەمریکا و، زۆر بوونی تاوان و کارەسات لە کۆمەڵگە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئافرەتەکان ماڵی خۆیان بەجێ هێشت"، ئینجا کێشەیان زیاتر بوو، بووە مایەی دابەزینی ڕەوشتیان، هەروەها ئەو پزیشکە

بانگی دایکەکان دەکا بەزووترین کات بگەڕێنەوە بۆ کاری ماڵەوە، بۆ ئەوەی ڕەوشتیان بگەڕێتەوە و، منداڵەکانیش پەروەردە ببن و بێبەش نەبن لە چاودێریی دایکیان، کە کاری کردووە بۆ بەرزبوونەوەی ئاستی ئابووریان، ئینجا دەڵێ: "لێکۆڵینەوەکان و ئەزموونەکان ئەوەیان دەرخستووە کە گەڕانەوەی ئافرەتەکان بۆ کاری ماڵەوە، تاکە ڕێگەیە بۆ چارەسەرکردن و ڕزگاربوونی ئەو نەوەیەی کە تووشی لادان و خراپەکاری بووە.

بەڵێ، ئەوان خۆیان دان بەو ڕاستییە دەنێن کە چوونە دەرەوەی ئافرەت و کارکردن لە بازاڕ و کۆمپانیاکان هەموویان هۆکاری داڕووخانی خێزانن، بە داخەوەش بە موسڵمان دەڵێن وشک و ڕەقە ناهێڵێت ژنەکەی بێتە دەرەوە و زیندانی کردووە، بەڵام نازانن پیاوی ئیماندار خێزانەکەی دەکاتە شاژن لە بەیانی دەڕواتە کار و داهاتی دەخاتە خزمەت خێزانەکەی و ژیانێکی بەختەوەری پڕ لە خۆشەویستی، ڕێز، ڕاستگۆیی و وەفای لەگەڵ بەسەر دەبات.

بەڵام بە داخەوە جاهیل و نەزانەکان هەڵخەڵەتاون بە ئەوروپا و ئەمریکا بەوەی خۆشترین ژیانیان هەیە، کەچی ڕاستییەکەی وەکوو ئاژەڵ دەژین، کەس نازانێ دایک و باوکی کێیە و خوشک و برای کێیە، زۆر لایان ئاساییە ژنەکانیان لەگەڵ هاوڕێکانیان ڕابوێرن.

"دکتۆر نورالدین عەنز"، دەڵێت: "یەکێک لە هاوڕێکانم کە خوێندنی باڵای لە ئەمریکا تەواو کردووە، بۆی گێڕامەوە کە لەنێو ئەمریکییەکاندا خەڵکانێک هەن، کە ژنەکانیان لەنێو خۆیاندا بۆ ماوەیەک دەگۆڕنەوە، دوای ئەو ماوەیە هەریەکە و دێت ژنەکەی خۆی دەباتەوە، هەروەک ئەو دێهاتییانەی کە

ئاژەڵەکانیان دەگۆڕنەوە، یان وەک ئەو شاریانەی کە هەندێک لە کەلوپەلەکانیان دەگۆڕنەوە."[1]

بۆیە پێویستە ئافرەتی موسڵمان باش تێ بگات کە چەند بەنرخ و ڕێزدارە لەلای پیاوە دیندارەکەی کە ئیسلام بەرنامەیەتی؛ با بە هیچ یەکێک لەو باسوخواس و بانگەشە بریقەدارانە فریو نەخوات، کە پێی دەڵێن: "خۆت ڕووت بکەوە تۆش ئازادی و بۆ خۆت هاوڕێیەتیی کوڕ بکە"، هەروەک شارستانێتیی ڕۆژاوا، بانگەشەی یەکسانیی نێوان ئافرەتان و پیاوان، ئەوە شارستانێتی نییە، بەڵکوو یەکسانکردنی مرۆڤە بە ئاژەڵان.

ئەمە بوو حاڵ و گوزەرانی ئافرەت لە ئەوروپا و ئەو وڵاتانەی کە گوایە لە ڕووی شارستانێتییەوە پێشکەوتوون، بەڵام بە داخەوە زۆر بەخراپی و نالەباری سوکایەتییان پێ دەکرێت، ڕووت دەکرێنەوە و، کراون بە کاڵای ڕابواردن و ڕێکلامی بازرگانی، بە هەموو شێوەیەک ئەو کەسە جاهیل و دەروونەخۆش و بێیاوڕانە تاوەکوو کچەکان گەنجن ئارەزووەکانی خۆیانیان پێ تێر دەکەن، کاتێکیش پیر دەبن وازیان لێ دەهێنن و بەرەڵڵایان دەکەن و، دەبێت لە خانەکانی بەساڵاچووواندا ژیان بەسەر ببەن، ئەمەش هیچ کەسێکی ئاقڵ پێی ڕازی نابێت جگە لە کەسێک نەبێت کە شۆرابێتەوە لە فیتڕەتی تەندروستیی خۆی، یان ویژدان و ئەقڵی نەخۆش بێت.

بۆیە کوفر چارەسەر و خۆشگوزەرانیی پێ نییە بۆ مرۆڤایەتی، جگە لە شەڕ، ئاژاوە، ناخۆشی، برسییەتی و نەبوونی، داماڵینی کۆمەڵگە لە ڕەوشت، شەرم و حەیا، بەڵام بەرنامە و یاسای ئیسلام جوانترین و دادگەرترین یاسایە، لەنێو

---

[1] - بڕوانه: إهانة المرأة في بلاد الغرب. محمد بن جميل زينو،

گشت بەرنامەکان تاکە ڕێسایە بۆ هێنانەدی خۆشگوزەرانیی مرۆڤایەتی کە پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ لە کۆتا ساتەکانی ژیانی و لە سەرەمەرگ وەسیەتی کردووە بۆ ئوممەتەکەی کە لەگەڵ ئافرەتاندا باش بن، وەک فەرموویەتی: ﴿اسْتَوْصُوا بالنِّساءِ خَيْرًا﴾[1] واتە: وەسیەتتان بۆ دەکەم کە لەگەڵ ئافرەتاندا بەباشی هەڵسوکەوت بکەن.

کەچی دژی ئیسلامن و بەرنامەی خودای گەورەیان پشتگوێ خستووە، بۆیە گەر هەموو خەڵکی دونیا کۆ ببنەوە تاوەکوو بەرنامەیەک دابنێن بۆ مرۆڤایەتی کە ژیانیان بەختەوەر و خۆش بکات، ئەوە سەرکەوتن بەدەست ناهێنن، چونکە چۆن دەکرێ بەرنامەیەک دابهێنرێ کە ئارەزووی دەستی مرۆڤەکان بێت دژی بەرنامەی خودای دروستکەری مرۆڤ!

بێگومان ئەگەر لەم دونیایەدا بگەڕێیت یاسا و ڕێسایەک بدۆزیتەوە بە شێوەی ئیسلام خۆشبەختی و بەختەوەری بۆ خێزان تێدا بێت، نایدۆزیتەوە؛ تەنیا ماندوبوونت بۆ دەمێنێتەوە، ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾[2]. واتە: ئاخر بۆ بیر ناکەنەوە کێ هەیە بەقەدەر خودا حوکمی جوان، دادپەروەر، چاک و بەجێ بێت، بەتایبەت لای ئەو کەسانەی کە بەوردی سەرنج دەدەن و ویژدان و هەستی زیندوویان هەیە.

پاشان هیچ کەس بە غەیری ئەو مرۆڤانەی پێوەستن بە بەرنامەی خودای گەورە کە ئیسلامە و ئیماندارن لە ژیان تێ نەگەیشتوونە، واتە: ئاقڵ و ژیر نین، خودای گەورە بە هۆی بەرنامەی ئیسلامەوە موسڵمانەکانی کردووە بە

[1] - متفق عليه.

[2] - بڕوانە: سورەتی المائدة، ئایەتی (٥٠).

یەک جەستە و، هەموو دڵەکان بە یەکەوە دەبەستێتەوە، دڵەکانیان پڕ دەکات لە خۆشەویستیی یەکتر، تاوەکوو هەریەکێک لەوان بۆ یەکتر ببنە یەک جەستە و بۆ دینی خودا تێ بکۆشن و، سەرەنجام بەهەشتیان بکاتە خەڵات.

**﴿عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﴿رضي الله عنه﴾ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ (مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ وَتَرَاحُمِهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ مَثَلُ الْجَسَدِ، إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بِالسَّهَرِ وَالْحُمَّى﴾**[1]. واتە: لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە (ڕەزای خودای گەورە لێ بێت)، دەڵێ: پێغەمبەری ئازیز ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ فەرموویەتی: نموونەی ئیمانداران لەنێو خۆیاندا لە بەزەییهاتنەوەیان بە یەکتریی و یەکتر خۆشوویستنیان و لە هاوسۆزییان بەرانبەر بە یەکتری وەکوو یەک جەستەن، کە ئەندامێکی ئازاری هەبێت، هەر هەموو ئەندامەکانی تری جەستەکە تایان لێ دێت و شەونخوونی بۆ دەکێشن.

بەڵێ، پێغەمبەری ئازیز ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ نموونەی موسڵمان بۆ یەکتر وەک یەک جەستە دێنێتەوە، واتە: یەکێکیان نەخۆش بوو یان ئازاری هەبوو، ئەوەی تر هەست بە ئازار و نەخۆشییەکەی دەکات، دڵی خۆش نابێت، تاوەکوو ئیماندارەکە ئازاری لەسەر سووک نەبێت، دڵی خۆش نابێت، تاوەکوو ئەویش تێر نەبێت، دڵی خۆش نابێت، تاوەکوو ئەویش لە خۆشیدا نەبێت، هەروەکوو خۆی لە خۆشیدایە.

بۆیە ئەم سۆز و بەزەییە تەنیا بۆ برا و خوشکی ئیمانییە، ئەی ئەگەر ئەو کەسە خێزانی خۆی بێت چەند بەبەزەیی، سۆز و باش دەبێت بۆی، بۆیە ئەو ئیماندارە ژیر و ئاقڵانەی کە بۆ خودا سوڵحاون، زۆر بەبەزەیی، سۆز و

---

[1] - بڕوانە: سەحیحی بوخاری، ژمارەی فەرمووده (٥٦٦٥).

میهرەبانن، لە ژیانی دونیا تێ گەیشتوونە کە تاقیکردنەوەی خودایە، بۆیە هەوڵدەدەن ژیانی و لێدانی ترپەی دڵ و، وەرگرتن و دانەوەی هەناسەکەیان و مردنیان هەموو بۆ ڕەزامەندیی خودای گەورە بێت.
کە وا بوو، خوشکانی ئیماندار تاکە خەم و ئاواتیان دەبێ گەنجی دیندار و یەکخواپەرست بێت، بۆ ئەوەی ژیانێکی بەختەوەریان بۆ دەستەبەر بکات. ئەو گەنجەی، ئیسلام و بەرنامەی خودای لە گیان و هەموو شتێکی خۆشتر دەوێت، بۆیە ئەی خوشکی من، بە هیچ شێوەیەک ئەم گەنجە دیندارانە لەدەست مەدەن، بۆ ئەوەی ئەم تەمەنە کەمە و کورتەی ژیانی دونیا بە خۆشەویستی و بەختەوەری لەگەڵ یەک بەسەر ببەن و لە ڕۆژی دوایی بەهەشتی نەبڕاوە ببێتە شوێنی ئەبەدیتان و بۆ یەکجارییش بە یەکتر شاد ببنەوە، بە ئیزنی خودای گەورە.

# چی گرنگە بۆ ڕۆژی مارەبرین و گواستنەوە

گەنجی ئیماندار و ژیر لە كوڕان و كچان خەمیان ئەوەیە لە ژیانی هاوسەرگیری كە بەختەوەر و بێ كێشە بن لەگەڵ یەكتر، نەك خەمی ئەوەی ڕۆژی مارە برین و گواستنەوە و بووك چۆن بەڕێ بكەن، كەچی بكەن و چ مۆدیلی جل و ستایل لەبەر بكەن و چ كامێرایەكی بەناوبانگ بانگ بكەن بۆ گرتنی ڤیدۆیی شێوازی مۆدێلانەی بگرن بۆ ڕۆژی گواستنەوە، ئیجا جوانی خۆیان دەربێخەن لە پێش چاوی خەڵك.

بەداخەوە بەڕاستی سەردەمی خۆ دەرخستن و چاولێكەرییە، كچە جاهیل و دوور لە دینەكان ڕۆژی مارەكردنیان بە هەڵاو بەزم و كێكی گەورە و چوونە ساڵۆن بە ملیۆنێک و داگرتنی مۆم و بەرداغی شەربەت لەیەک دان و جوانی خۆیان دەرئەخەن و وێنەگرتنی سناپ و بڵاوكردنەوە لە تیكتۆک و ستۆری و پۆستەكان بۆتە ئاوات و خەم و خولیایان، بۆیە زۆرێک بەناو موسڵمانیش چاویان لێدەكەن و مەرجی ئەوە بۆ كوڕەكە دائەنێ ڕۆژێ مارەكردن و گواستنەوەی بەمجۆرە بێ ساڵۆن و كێک و بەدڵە و جلی مۆدیل لەبەر بكات جگە ڕۆژی گواستنەوە، كە ئەویش جۆرە مۆدیل و مەسروفاتێكی تر.

بۆیە ناخۆشی و كێشە و جیابوونەوە و تەڵاق زۆربووە و خێزانەكان هەموو هەڵوەشاونەتەوە، ڕۆژ نیە دەیان خێزان تەڵاق نەدرێن،

چونكە بەرنامەیان نیە بۆ دوای مارەبڕین و گواستنەوە، كە ژیانیان چۆن بەڕێ دەكەن و بەختەوەری بەدەست بێنن.

زۆرینەی گەنجان پەنا بە خوای گەورە کە خۆیان پێ موسڵمانە بە شێوازێکی ناشەرعی ئەو ڕۆژە بەڕێ دەکەن، بێ ئەوەی هیچ حساب بۆ چاودێری خوای گەورە بکەن، ئەڵێن چیە کاکە یەك ڕۆژە خۆ هەموو ڕۆژ نیە، بۆیە بەداخەوە لەو ڕۆژەدا ئیمانی زۆرینە بەدەر ئەکەوێت، کە چەندە پابەندی ئیسلامن و چەندیش بەس بەناو موسڵمانن، کە چۆن سەرەتا پێش هاوسەرگیریان خۆیان پێ کەسی چاك و باش بوو بەردەوام بانگەوازیان بۆ ئیسلام دەکرد، کەچی زۆر سەیرە سبحان الله نازانم بۆچی ئەوەندە زوو دەگۆڕێن، و خۆشی دونیا هەلیاندەخەلەتێنن، کچی عەباش هەبوو شوی بە کوڕێک کردوو لەبەر خاتری کوڕەکە لە ڕۆژی مارەکردن سفوربووە و جوانی خۆی بەدەر خستووە بەس لەبەر ئەوەی کوڕەکە پێ گوتوە حەزم لێیە ئەو ڕۆژە لەبەر من خۆت جوان بکەیت نازانێت بۆ خۆی نیە بۆ خەڵکی عەرزی دەکات زۆر بەداخەوە بۆ ئەو جۆرە کوڕو کچانە بەناو دیندار و لە خواترس ئەگەر ئەوانە بەقەد زەڕەیەک بیریان لەوە کردبایەوە کە هەموو ئامانجیان تەنیا ژیانێکی خۆش و بەختەوەربێت بەو شێوەیەی کە خوای گەورە فەرمانی داوە هەرگیز ناخۆشی و کێشە ڕووی لە ژیانیان نەدەکرد.

ئەوجا هەموو شت بۆتە چاولێکەری و پێشبڕێکی لەگەڵ یەکتر زۆر کچ هەیە دەبینێ هاوڕێ و دراوسێ و دەوروبەری چۆن ڕۆژی مارەبڕین بە کێکی گەورەو مۆم داگرتن و جلی بوکینی مۆدیل و ساڵۆنی گرانبەها کردووە ئەویش چاوی لێدەکات و بڕیار دەدا بەو شێوەیە نەبێ شوو نەکات.

ئەو کچ و کوڕەی ئیماندار ئەگەر ڕەزامەندی خوایان مەبەست بی لەپیناو یەکتری هەموو قوربانیدان و شتێک دەکەن و گوی بەقسەی خەڵکی نادەن.

كە زۆر كەس دەڵێ خۆ تەنها ڕۆژێكە بەڵام ئەوە یەكەم رۆژی ژیانی نوێتە بەو گوناحانەوە دەستی پێدەكەی كە دەرخستنی جوانی خێزانەكەتە بۆ ئەو خەڵكە بەرەكەت لە هاوسەرگیرەكە نابینی دڵی مرۆڤ جێگای یەک شت دەبێتەوە یان بۆ الله تعالی و دینەكەی پاشان یانیش دونیا و ڕازی كردنی دڵی خەلک كە تۆش وەک خەڵک بكەی ئیتر دیارە كە ریزی فەرمانەكانی الله تعالی ناگریت و هەروەها لەسەر قسە و دینی خەڵكەكە دەڕۆی، گەنجی ئیماندار بەشێوەیەكی شەرعی و دوور لە تاوان و سنور بەزاندنی خوای گەورە ڕۆژی مارە برین و گواستنەوە بەڕێ دەكات، ڕازییە ژنەكەی بە جلی كۆن و ماڵەوە بگوازێتەوە بێ تەرتیبات و جوانكاری سەناعی و دەسكرد و نینۆك و برژانكی درۆینە و ساڵۆن و هەڵاو بەزم، كە پارەیەكی خەیالی بۆ تاقە ڕۆژێک لێ بەفیرۆ بدات، و خەڵكی نامەحرەم بێن وێنەتان لەگەڵ بگرن، وێنەتان بلاوبێتەوە.

ئەو گەنجە كوڕ و كچە ئیمانداره یەكتریان قبوڵە كە بەچ شێوەیەك ڕۆژەكە بەڕێ بكەن، گاڵتەیان بە كەسانی دونیا پەرست و ڕوو لەخۆشی دونیای كاتی دێت، ئامادەن بەشەوی تاریك دوور لە چاوی خەڵك ئەو گواستنەوەیە ئەنجام بدەن، چونكە تێگەیشتوو و ژیرن دەزانن بەختەوەری مانای ئەوەنیە جوانی خێزانەكەی بۆ خەڵكی بەدەر بخات، بەڵكو بەختەوەری لەوكاتە دەست پێ دەكات لەگەڵ یەكتر ئەژین ئایە چەن ڕێز و گرنگی و خۆشەویستی لە نێوانیانە، چەند بەرگەی ناخۆشی و نەبوونی و كێشەی نێوانیان دەگرن، مەبەستی ئێمە تەنها ئەوەیە چۆن گەنجانی ئیماندار بەختەوەری بەدەست بێنێت و بەختەوەر بژین.

بۆیە ڕەحمەتان لێبێت ئارام بگرن و بگەڕێن بۆ كەسێك كە لەگەڵی بژین دونیا نەویست و خودا ویست بێت تاكو بژیت لەگەڵی بە جەوێكی ئیمانی، و ڕۆژانە كاتی لەگەڵ بەسەر ببەی بەخۆشی و ڕێز و لێک تێگەیشتنەوە.

ئەمە سەلەفی ساڵحە پێشینە چاكەكانمان وەسیەت و ئامۆژگاریمان دەكەن بەوەی لە ژیان لەگەڵ كەسێك دابنیشین كە هانمان بدەن بۆ قیامەت و ژیان لە پێناو خودای گەورە و نەفەوتاندنی تەمەن لە پێناو خۆشی ڕابواردنێكی كەم و هیچ، چونكە خۆشی و نیعمەتی دونیا واتە ژیان و دانیشتن لەگەڵ ئەو جۆرە كەسانە.

پێشەوا سوفیانی ثەوری (ڕەحمەتی الله تعالى لێبێت) دەفەرمووێت: با ئەو كەسەی لەگەڵیدا دائەنیشی كەسێک بێت فێرت بكات دوركەویەوە لە دونیا و وات لێ بكات ئارەزووی قیامەتت هەبێ و نەكەی لەگەڵ ئەهلی دونیا دابنیشی ئەوانەی لە باسی دونیادا نوقم ئەبن چونكە ئەوان دین و دڵت لێ تێک دەدەن و خراپیان دەكەن، و زۆر یادی مردن بكە و زۆر استغفرالله بكە لەو تاوانانەی كە كردوتن و داوای سەلامەتی لە الله بكە لەو تەمەنەی كە ماوتە.

**(ليكن جليسك مَن يُزَهِّدُكَ في الدنيا وَيُرَغِّبُكَ في الآخرة وإياك ومجالسة أهل الدنيا الذين، يخوضون في حديث الدنيا فإنهم يفسدون عليك دينك وقلبك، وأكثر ذكر الموت وأكثر الاستغفار مما قد سلف من ذنوبك وسل الله السلامة لما بقي من عمرك)**[1].

بۆیە بۆ ئەوەی تەواوی ڕۆژەكانت هاوڕێ بی لەگەڵ كەسی ئیماندار و ئەهلی قیامەت، و خۆشی ئاسوودیت پێ ببەخشن هەوڵدە ئەو جۆرە كەسانە

---

[1] - بڕوانە: حلية الأولياء ٨٢/٧

بەدەست بێنە و ڕازی مەبە و لە خۆتی قبووڵ مەکە بەوەی خەمی سەرەکیت کەسی جوان و دەوڵەمەند و کەشخەو قۆز و دونیا وویست بێ و مەیلی بەرەو خۆشی و هەڵاو بەزمی دونیا بێت.

پاشان بۆ مارەبڕین پێویستی بە بەدڵە و ساڵۆن و جوانکاری و تێکەڵاوی و کێک بڕین و مۆم داگرتن و وێنە گرتن لە پارك لەگەڵ خەڵک نیە، و لە دەستکردنی ئەڵقە لە پەنجەی یەکتر ئەمە چاوڵێکەری بێباوڕان و کافرانە، ئەم کارە نە پێغەمبەری ئازیز ﷺ نە هاوەڵەکانی و نە تابعین کەسیان لە کاتی مارەبڕین ئەڵقەیان نەگۆڕیوەتەو و لە دەستیان نەکردووە، ئەم کارەیان نەکردووە و لە ئیسلامدا نیە، موسڵمان دەبێ شوێن ئیسلامەکەی بکەوێت، نەك کافر و بێباوەڕان، بۆیە دەتوانن کە پیاو و ئافرەتان لە شوێنی جیاوازبن کە تێکەڵاوی دروست نەبێت کچەکە جلێک شەرعی بپۆشێ و جوانکاری و مکیاج نەکات، کوڕەکەش بەهەمان شێوە بە مۆدێل و قژچاکردنی خۆی ڕێک نەخات کە لاسایی کردنەوەی کافران بێت، بەشێوەیەکی جوان و ئاسای بێت، پێویست ناکات کوڕ و کچەکە پێکەوە بن و خەڵک وێنەیان لەگەڵ بگرێ، نابێ ڕێگە بدەن کەس وێنەیان بگرن، ئەگەر لەگەڵ ئافرەتانیش بێت چونکە زۆربەی پیاوی ئەو ئافرەتانەی وێنەی گرتووە لەگەڵ بووك دەڵێن کوا وێنەکە بێنە سەیر بکەین بزانین جوانە، بۆیە نابێت ڕێگە بدەن کەس وێنەیان بگرن.

بۆ گواستنەوەش کچەکە بەهەمان شێوە جلێکی شەرعی بپۆشێت دوور لە چاوی خەڵک، کۆبونەوەکە لە باخچەک بکەن کە ئافرەت لە لایەک بن و پیاوان لەلایەک، دووربکەونەوە لە شایی و گۆرانی ناشەرعی لەبڕی ئەوە بانگخوازێکی عەقیدە پاك ئامۆژگاریان بکات و بتوانن کە کتێبی دینی و

ئامۆژگاری بێت بەسەر خەڵکەکە دابەش بکەن بەڵکو ببێتە چاکەیەکی نەبڕاوە بۆیان.

دوای بڵاوکردنەوەی ئەم بابەتە وویستم بیرو بۆچوونی خوێنەران وەربگرم، دایکێکی نموونەیی ئیماندار نامەیەکی بۆ ناردم بەم شێوەیە باسی بە شوودانی کچەکەی کرد:

بامن شتێک بەبرای خۆم بلێم من تا لەژیانی خۆم شتێک تەتبیق نەکەم بەخەڵکی تر نالێم دەبێ دین لەکردارمان ڕەنگ بداتەوە، من کچم بەشوودا یەکەم شت گوتم ئەڵقەمان ناوێ نە خێزانی پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ نە خێزانی سەحابە بەڕێزەکان داوای ئەڵقەیان نەکردوە.

دووەم شت بەدڵەو سالۆن لە لای ئێمە نیە شتێکی زیادەو چاولێکەری جاهیل و نەفام و دونیاویستانە، هەستام جلێکی کوردی جوانم بۆی دوری لەگەڵ نیقاب لە ڕەنگی جلەکە ڕەنگی سپیم هەر بەکار نەهێنا،وە وێنەگرتنیش قەدەغەیە، خۆیان بەتەنهاش وێنەیان نەگرت چونکە هەردوولا پێمان وایە جائیز نیە.

وە بۆ گواستنەوەش بەهەمان شێوە بەبێ دەنگی بێ هەراو مەسروفاتی زۆر تەنها زاواو دایکی و خوشکی هاتن کەسی تریان لەگەڵ نەبوو، بێ بەدڵە و سالۆن و کامیراو دور لە هەموو شتێکی چاولێکەری وە بەشەو بێ ئەوەی هیچ کەس ئاگاداربێت، پاش نوێژی عیشا هاتن بردیان هەر لە ژوورەوە بەنیقاب تا مالی زاوا  ئاخر بزانم هیچ شتێکی خراپ ڕویدا الحمدللە دەسپێکی ژیانێکی ئاسودەو بەختەوەر و بێ کێشەن لەسەر سوننەتی رسول الله ﴿ﷺ﴾ چۆن الله تعالی ڕەحمەت و بەرەکەتی خۆی نارێژێ بەسەر خێزانێکی ئاوا.

خوای گەورە نموونەی ئەم دایك و كچە زۆر بكات لە نێو موسڵمانان.
کچ و کوڕی ئیماندار و ژیر بیر لە ئاسانترین ڕێگەو مەرج دەکەنەوە بۆ ئەوەی پێک بگەن و ژیانی هاوسەریەتی پێک بێنن، هەندێک لەو کچ و کوڕانەش بەهۆی قسەی دەوروبەر ناتوانن بە شێوەی شەرعی مارەبڕین و گواستنەوە ئەنجام بدەن کە زۆرجار خێزانی هەردوولا بەتایبەتیش خێزانی کچ کە بە سوکایەتی بۆ کچەکەیان ئەزانن و قسەو گوتی گوتیش زۆر دەکرێت کە گەر ئیمانت بەهێز نەبێت ناتوانی بەسەریدا زاڵ بیت بۆیە پێویستە کوڕ و کچ ئیمانەکەیان نەدۆڕێنن و بە ماڵەوەی یەکتر بڵێن ئێمە ڕێککەوتووینە بەم شێوە مارەبڕین و گواستنەوە ئەنجام بدەین ئیتر کەس قسە نەکات بۆچی وادەکەن و واناکەن، ئەوە ژیانی خۆمانە کەس قسە لەژیانمان نەکات، دەبێ کچەش دایک و باوکی حاڵی بکات کە بەختەوەری هاوسەرگیری تەنها ڕۆژی مارەبڕین و گواستنەوە بە شێوەی مۆدیل و خەیاڵی چوونە ساڵۆنی گرانبەها نیە، بەڵکو بەختەوەری ئەوەیە کە پیاوەکەم ڕێزم بگرێت و بە هەموو دونیا نەمگۆڕێتەوە و خراپ و دڵ ڕەق و دڵپیس نەبێ لەگەڵم، بۆیە براو خوشکانم بیکەنە مەرج بۆ یەکتر پێش چوونە مارە بڕین بە یەکتری بڵێن کەمن بە شێوەی شەرعی نەبێ نامەوێ هاوسەرگیری بکەم دەبێ خەمی سەرەکیان بۆ دوای مارە بڕین و گواستنەوە بێت کە چۆن بەرنامە دانێن بەوەی بۆ الله تعالی بژین و الله لە خۆیان ڕازی بکەن، الله تعالی ڕەحم بە حاڵی هەموومان بکات.

## هەلسوكەوتی ژن و مێردی ژیر دەبێ چۆن بێت.

سەرەتا پێش هەموو شتێك بۆ ژیانێكی بەختەوەر دەبێت ئێمەی گەنجان و بەتایبەت ئیماندار بیر لە داهاتوومان بكەینەوە بزانین كە لە پێناوچی و چۆن و بۆچی و بەچ شێوەیەك ژیانی خۆمان لە دونیا بەڕێوە ئەبەین و ئەژین و بەتایبەت ئیمان و ئیسلامەكەمان نەدۆڕێنین كە مایەیی سەرفرازی و بەختەوەریمانە، نابێ وەكو گەنجانی دوور لە ئیسلام بژین و سنورەكانی خوای گەورە پێشیل بكەین و فەرمان و بەرنامەكەی پشتگوێ بخەین، چونكە گەر وابكەین پەنا بە خوای گەورە ژیانی دونیا و دوارۆژمان دەفەوتێنین، خۆمان لەناو ئەبین، لە دەریایی جەهالەت و نەزانین دۆزەخێك بۆ خۆمان ئەسازێنین و تێیدا بە شێوەیەك نە بمرین و نە بژین، هەروەكو خوای گەورە دەربارەی حاڵی دۆزەخیەكان ئەفەرمووێت: ﴿وَيَأْتِيهِ الْمَوْتُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ وَمِن وَرَائِهِ عَذَابٌ غَلِيظٌ﴾[١] واتە: مەرگیش لە هەموو لایەكەوە هێرشی بۆ دەهێنێت، كەچی ناشمرێت، لەوەودواش سزاو ئازاری هەمەجۆرو ناخۆش و گران یەخە ی بەرنادات.

بۆیە موسڵمان دەبێ ژیر و ئاقڵ بێت و هەوڵبدات پابەندی بەرنامەكەی بێت كە ئیسلامە، چونكە پەیوەست بوونت بەم بەرنامەیە ڕەحمەت و سەرفرازی و خۆشبەختییە، وات لێدەكات چۆن بجوڵێیتەوە و هەڵسوكەوتت چۆن بێ

[١]- بڕوانە: سورەتی ئیبراهیم ئایەتی: ١٧

بەرامبەر بە بچوكترین شتی دونیا، بۆ نموونە سەیر بكەین سەلەفی سالْح، پێشینە چاكەكان هەلسوكەوت و رفتاریان چۆن بووە بەرامبەر مێروولە.

لە باوكی عبداللەی كوازی دەگێڕێتەوە لە حبیبەی حزمەتكاری ئەحنەفی كوڕی قەیس (رەحمەتی اللەی لێبێت) كە بینی خەریكی كوشتنی مێروولەیە، فەرمووی: مەیانكوژە پاشان داوای كورسییەكی كرد بۆیان هێناو لەسەری دانیشت و سوپاس و ستایشی خوای گەورەی كردو فەرمووی: من سوێندتان ئەدەم لە ماڵەكەم دەرچن، من پێم خۆش نییە لە ماڵی مندا بكوژرێن، ئیتر مێروولەكان ڕۆیشتن و دوای ئەو ڕۆژە تاكە مێروولەیەك نەبینرا..!!

﴿عن أبو عبد الله الكواز: حدثتني حبيبة مولاة الأحنف, أنها رأت الأحنف بن قيس (رحمه الله) ورآها تقتل نملة, فقال: لا تقتليها, ثم دعا بكرسي فجلس عليه, فحمد الله و أثنى عليه, فقال: إني أحرج عليكن إلا خرجتن من داري فإني أكره أن تقتلن في داري. قال: فخرجن, فما رؤي منهن بعد ذلك اليوم واحدة﴾[1].

مەبەستمان لەم نموونەیە تەنها ئەوەیە بزانن كە ئیسلام چۆن مرۆڤ پەروەردە ئەكات، ژیر و ئەقڵ و تێگەیشتنی پێ ئەبەخشێت، كە چۆن بە رەحم و سۆز و میهرەبان بن بەرامبەر بچووكترین بونەوەر، زۆری كێشەو ناخۆشی و كوشتنەكانی ئەم سەردەمە بۆ ئەوە دەگەرێتەوە مرۆڤ دوورە لە ئیسلام، دوورە لە خۆشی و كامەرانی، سەرەكی ترین خۆشی لە دونیا لە نێو بازنەی

---

[1]- بڕوانە: الآداب الشرعية لإبن مفلح٣/٣٥٣.

ئیسلامە، وەکو گوتمان ئیسلام ژیری ئەبەخشێ بە ئەقڵ و هۆش، شارەزای چۆنیەتی هەلسوکەوتی کەسی بەرامبەرت دەکات، ئەوکاتە پیاو لە ژنەکەی تێدەگات و لە سیفەت و حەزەکانی ژنەکەی شارەزایە دەزانێ ژن حەزی بە گرنگی پێدان و ناز هەڵگرتن و خۆشەویستی پێدانە، بەهەمان شێوە ژنی ئیماندار تێدەگات لە پیاوەکەی کە حەزی لێیە ژنەکەی ڕێزی بگرێت و بێ رێز و دەمشڕ و قسە ڕەق و بە بۆلە بۆڵ نەبێ بەرامبەری، لای خزم و میوان ڕێز و ئیحترامی بگرێت، ئەوکات ژیانیان بەختەوەر دەبێ و پیاوەکەی بێ سنور و ئەندازە گرنگی بە خێزانی خۆی دەدات و نوێژی مردوو بە نۆ تەکبیر لەسەر گشت ژنانی دونیا دەکات، بۆ ئەبەدی و یەکجاری وابەستەی ژنەکەی دەبێ، و تەنها مردن لەیەکیان جیا دەکاتەوە، بۆ ژنەکەی دەژی و تەواوی خۆشەویستی و رێز پێ دەدات، کاتی تورەی و دڵتەنگی ژنەکەی ئەزانێت، بۆیە کاتێك تورەیە یان بێتاقەتە شارەزایە چۆن دڵی خۆشبکات و دەست ئەکاتە مڵی و بەقسەی جوان و ناسك پێی هەڵئەدات و خۆشەویستی بۆ دەر ئەبڕێت، یان سیفەتی ژن وایە حەزی بە قاپ و قاچاغی ناو ماڵە، ئەڕواتە سەرەدانی هاوڕێکەی شتێك ئەبینێ سەرنجی رائەکێشێ و حەز ئەکات ئەویش هەیبێت، بۆیە بە پیاوەکەی دەڵێ فلان شتم بۆ بکڕە هاوڕێکەمیش ئەو شتەی هەیە، گەر پیاوەکەی جاهیل و دوور لە دین بێت بەقسەی ڕەق و ناخۆش باشە دەکرم بۆت بە ملی شکاوت ئەوەندە حەزت لەشت نەبێت، واتە بە ئوسلوبێکی ناشرین لەگەڵی دەجوڵێتەوە، بەڵام گەر پیاوەکەی ئیماندار و ئەهلی تەوحید بێت زۆر

جیاوازە، ئەگەر پیاوەکەش هەژار و نەبوون بێت، و ژنەکەی پێی بڵێت هاورێکە م فلان شتیان هەیە یان هەر بۆی باس بکات کە ماڵی فلان ئەو شتە جوانەیان هەیە، پێی ئەڵێت ئارام بگرە، خوا وویستی لێبێت بەیەکەوە ئەیکڕین، بەشێوازێکی جوان و نەرم بۆ ئەوەی دڵی نەشکێ و خەم نەخوات بۆی ڕوون دەکاتەوە، ئەو پیاوە هەر لە بیرو خەیالی دەبێ گەر پارەی نەبێ هەوڵدەدات بەهەر جۆرێك بێ پارە پەیدا بکات و ئەو شتەی بۆ بکڕێت تاکو دڵی خێزانەکەی خۆشبێت.

زۆربەی کێشەکانی خێزان و جیابوونەوە و تەلاق، لەیەك تێنەگەیشتنەوە سەر هەڵدەدات، ژن سیفاتی وایە بەناز و مەکر و داواکاریان زۆرە و هەست و سۆز و عاتیفی زاڵە بەسەریان، پیاویش تورە و توندبێ بەم شێوەیە ژیان لەگەڵ یەکتر ناگونجێت دەبێ پیاو لێزان و زۆرزان و بە حیکمەت بێت بۆئەوەی لەگەڵ ئافرەت بگونجێ و بێتەوە.

هەر بۆیە پێغەمبەری ئازیز ئاگاداری کردووینەتەوە کە ئافرەت لە پەرسو دروست کراوە، کە خوارە شێوازی، یانی دەبێ زۆر لێزان و بە سیاسەت بی چۆن دڵی خێزانەکەت ڕادەگریت، نابێ بە توندی و ڕەقی لەگەڵی بجولێیتەوە مەگەر سنوری شەرعی پێشیل کردبوو ئەوکات جۆری ترە، چونکە دەروخێ و دەشکێت کە شکا چاك بوونەوەی زۆر زەحمەتە، وە نابێ ئیهماڵ بکرێت، وەکو گوتمان حەزی بەگرنگی پێدان و نازە گەر ئیهماڵکرا وەکو مردووی لێدێت بەهەمان شێوە دەروخێت.

پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ دەفەرموێت: ﴿اسْتَوْصُوا بالنِّساءِ خَيْرًا؛ فإنَّهُنَّ خُلِقْنَ مِن ضِلَعٍ، وإنَّ أعْوَجَ شَيءٍ في الضِّلَعِ أعْلاهُ، فإنْ ذَهَبْتَ تُقِيمُهُ كَسَرْتَهُ، وإنْ تَرَكْتَهُ لَمْ يَزَلْ أعْوَجَ، فاسْتَوْصُوا بالنِّساءِ خَيْرًا[١]﴾.

واتە: ئامۆژگاری ئافرەتان بکەن بەچاک، چونکە ئەوان لە پەراسوی سەری سەرەوە کەخوارەکەیە دروست بوونە، ئەگەر بەشێوەکی توند لەگەڵی بجوڵێیەوە دەشکێ وەگەر هەر بەم شێوەیەی هەیە جێت هێشت ئەوا هەر بە خواری دەمێنێتەوە، دوبارە فەرمووی ئامۆژگاری ئافرەت بەچاک بکەن.

بۆیە پیاو ژنەکەی دەبێ وەکو منداڵ نازی پێ بدات و گرنگی پێبدات، بزانێت چۆن لەگەڵی دەجولێتەوە و ڕفتاری لەگەڵ دەکات، ئێمە لێرە مەبەستمان ڕاستی و حەقیقەت روون بکەینەوە و جیاوازی گەنجی ئیمانداری ڕاستەقینە و دوور لە ئیسلام بخەینە ڕوو بۆ ئەوەی خوشکان دوودڵ نەبن لەوەی شوویان پێ بکەن، چونکە وەکو گوتمان زۆرینەی پیاوان لە ئافرەت تێناگەن، وادەزانن ئافرەت هەر دەزگایەکە بۆ ڕابواردن و کات بەسەر بردن بەکار دێت، کە لێی تێر بوو ئیتر پشتی لێبکەی بۆیە ئافرەت توانای قبووڵکردنی ڕەق و خراپی هەڵسوکەوتی پیاوەکەی نابێ، ئیتر کێشە و دەقاڵێ دروست دەبێ و سەرنجام جیابوونەوە و تەلاقی لێ دەکەوێتەوە.

بۆیە گرنکە هەردوولا بۆیەکتر بژین و تەنها گرتگی بەیەك بدەن، چونکە تازە بوونەتە هاوسەری یەکتر و باوك و دایك و کەسە نزیکەکانیان لە پێناو یەکتر

---

[١] ـ متفق علیه

یەكتر بەجێ هێشتووە، بۆیە بێ ئەقڵی و نەزانینە خراپ بن لەگەڵ یەكتر چونكە لە داهاتوو زەرەر دەكەن و شەرمەزاری نێو خەڵكیش ئەبن كە دوو كەسی خراپ و بەكێشەن هەموو بە چاوی سووك و كەم سەیرتان ئەكەن، نزیكتان نابنەوە.

بەداخەوەش كە زۆرینەی خێزانەكان و ئەگەر كەمێكی نەبێ گەرنا زۆربەی بێ ڕێزن بەرامبەر یەك شەرمیان بەرامبەر یەك نەماوە لای خەڵك زەمی یەكتر و بەخراپ باسی یەكتری دەكەن، و كەم و كورتی یەكتر ئاشكرا ئەكەن وەلا پیاوەكەم زۆر پیس و چلكنە، بۆنی ئارەقی لێدێ، ئاوایە و ئاوایە، یان پیاوەكە دەڵێ وەلا ژنەكەم نازانێ خواردن دروست بكات، ئەو ڕۆژی ئەوەندە خوێی كردبویە برنجەكە هەر نەمخوارد، بەم شێوەیە یەكتر سووك دەكەن و خۆشەویستی نێوانیان نامێنێ و رق و كینە و ناخۆشی لە نێوانیان سەر هەڵدەدات، بەساردی و سڕی وەكو ئەوەی دوژمنی یەكتر بن بەیەكەوە بە ناچاری ئەبێ ژیان بەرێ بكەن.

كوڕ و كچی ئیماندار زۆر جیاوازن لەگەڵ یەكتر هەولدەدەن دڵی یەكتری خۆشبكەن، بیر دەكەنەوە چ ڕێگایەك بەكار بێنن بۆ ئەوەی دڵی یەكتر خۆشبكەن، كاتیان نیە بۆ سوككردن و بێ رێزی كردن بەیەك، لە ژیانی دونیا تێگەیشتوونە هەموو كاتیە و بەجێی دێلن بۆیە هەوڵدەدەن بۆیەكتر بژین و بێ رادە یەكتریان خۆشبوێت، چاو لە پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ دەكەن كە چۆن و چ بكەن بۆ ئەوەی ژیانیان بەختەوەر و بێ كێشە بێت.

ئەمە ئامۆژگاریەكی زێڕینی پێغەمبەری ئازیزمانە ﷺ بۆ ئافرەتی خاوەن مێرد، "بۆ ئەوەی دوور بن لە كێشە و ناخۆشیی خراپبوون و ساردبوونی پیاوەكانیان،

ئەوا با گرنگی بدەن بە پیاوەکانیان و، باسی جوانی و قۆزی ژن و کچی خەڵکی و کچی جیرانەکانیان بۆ پیاوەکانیان نەکەن"، بە داخەوە ئەوە سیفەت و ڕەوشتی زۆربەی ئافرەتانە، هیچ قسە و باسیان لا نییە، بۆیە بەردەوام باسی فلان ژن و کچ بۆ پیاوەکانیان دەکەن، فلان کچی جوان و ناسک شووی بە فلان کوڕ کرد، حەیف! ئەم کچە شووی بەو کوڕە ناشرینە کردووە، بەردەوام قسەی ئاوا بۆ پیاویان دەکەن، ئەمەش هەڵەیە چونکە پیاو لەزەین و داڵغەی ناڕوات، پەنا بە خودا شەیتان وازی لێ ناهێنێ، تاوەکوو تووشی تاوانی دەکات، هەربۆیە پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ لە ئامۆژگارییەکەیدا دەفەرمووێت: ﴿**لا تُبَاشِرُ الْمَرْأَةُ الْمَرْأَةَ فَتَنْعَتَهَا لِزَوْجِهَا كَأَنَّهُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا**﴾[1] واتە: با ئافرەت وەسفی جوانی و شۆخ و شەنگی ئافرەتێکی تر بۆ مێردەکەی نەکات بەو شێوەیەی، کە وا لە مێردەکەی بکات تەماشای بکات و ئاواش وەسفی دەکات، کە دەیهێنێتە پێش چاوی.

ئەم ئامۆژگارییەی پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ دەروونی ئادەمیزاد بەدیار دەخات و دەیناسێنێ و مەترسییەکەشی دەخاتە ڕوو، کە زۆر جار بە هۆی وەسفکردنی ئافرەتێک بۆ پیاو، دەبێتە هۆی ئەوەی دڵی پیاوەکە بۆ لای ئافرەتە وەسفکراوەکە بچێ، قەت لەبیر و هۆشی نەڕوات و نیازی خراپی هەبێ و، ئافرەتەکە ببێتە نێچیری خۆشەویستی.

هەربۆیە ئیبن قەیم (ڕەحمەتی خودای گەورەی لێ بێت)، دەڵێ: "ئەو شتانەی دەبنە هۆی خۆشەویستی بۆ خۆشەویستراو چوارن: یەکێکیان: تەماشاکردن

[1]- بڕوانە: سەحیحی بوخاری، ژمارەی فەرموودە (٥٢٤٠).

بە چاو، یان بە دڵ، کە بۆی وەسف دەکرێ، چونکە زۆربەی خەڵک خۆشەویستییان بەبێ بینین بۆ دروست دەبێ".[1]

جا لەبەر ئەمە پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ ڕێگری کردووە لەوەی ئافرەت وەسفی ئافرەتێکی تر بۆ مێردەکەی بکات، لەپێناو ئەوەی ژن و مێرد دوور بن لە کێشە و جیابوونەوە. ئەی ئافرەتان، سەیر بکەن ئەم پێغەمبەرە ﴿ﷺ﴾خەمخۆرە چ ئامۆژگارییەکی جوان و ژیرانە بە گوێی ئافرەتانی خاوەن مێرددا دەدا و لەپێناو مانەوەی خۆشەویستییان بۆ یەکتری و بەختەوەربوونیان لە ژیانی یەکتردا.

بۆیە بیزانن لەم دونیایە هیچ کەس بە ئەندازەی ئیمانداری شوێنکەوتەی پێغەمبەری ئازیزمان ﴿ﷺ﴾ ئاقڵ و ژیر نین و لە ژیانی حالی بوونە بۆیە خوشکانم هەر کات کوڕێکی ئیماندار داخوازی کردی پەشیمان مەبەو دوودڵ مەبە دڵنیابە بەختەوەر دەبی بە ئیزنی الله و هەموو شت بە دڵی تۆ دەبێت.

---

[1] -بڕوانە: روضة المحبين، ص ٨٨.

# بۆ هاوسەرگیری بەدوای مرۆڤی کامل و تەواو مەگەڕێ

سەرەتا پێش هەموو شتێك دەبێ بزانین ئێمەی مرۆڤ دروستکراوین لە لایەن خوای گەورەوە، بەبێ ئەوەی هیچ شتێك لەسەر خودی خۆمان بزانین و پرسمان پێبکرێت، کە چۆن بێینە ژیانی دونیاو دروست بکرێن ﴿وَاللَّهُ أَخْرَجَكُمْ مِنْ بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْئًا﴾[١] واتە: خوا ئێوەی لە سکی دایکتان دەرهێناوە بێ ئەوەی هیچ شتێك بزانن.

بۆیە ئەگەر بگەڕێی لە دونیا کەسێك نادۆزیتەوە بێ عەیب و بێ کەم و کورتی بێت و کامل و تەواو بێت، و لە ڕووی جەستەی و بیرکردنەوە و هەر یەکەو عەیب و نوقسانیەکی هەیە، یانی ئەگەر لە ڕووی دەولەمەندیەوە ئەو کەسە ملیاردێر بێت، بەڵام لەڕووی هەڵسوکەوتەوە زۆر تورە و حەسەبییە، کەم و کورتیەکەی ئەوەیە کە تورەو توندە، کە لەگەڵی بژی لەسەر قسە و شتێکی زۆر بچووك بۆ ماوەیی هەفتە و مانگ قسەت لەگەڵ ناکات و مان دەگرێت، لێرە دا دەوڵەمەندیەکەی چ سوودی هەیە بۆت کاتێك بەمانگ خۆی لێت گرتەوە بێ بەش بوویت لە گرنگی پێدان و هەست و سۆز، یان کەسێکی زۆر جوانە و بێ وێنەیە لە جوانی بۆیە پێی ڕازی بووی بەڵام سیفاتی دڵ پیسی و دڵ نەخۆشی هەیە ناتوانی دوو قسە لەگەڵ خوشك و دایکت بکەی

[١]- بڕوانە: سوڕەتی النحل ئایەتی: ٧٨

لێپرسینەوەت لەگەڵ دەكات ها چیتان گوت باسی منتان دەكرد، بەردەوام گومان دەبات و دڵی پیسە، یان كەسی زۆر بەهێز و بازووە بەڵام لە ڕووی گرنگی پێدانەوە زۆربێ هەستە و بەردەوام دەڕواتە بازار بەڵام هەست ناكات خێزانەكەی پێویستی بەچیە یان هەر خۆی بیربكاتەوە دیارییەك یان شتێكی بچووكیش بێت بكڕیت بۆ خێزانەكەی تا دڵی خۆشبێت و هەست بكات كەسێكی هەیە كە گرنگە لای، بۆیە ئەی خوشكی من لەم ژیانەی دونیا بە تەما مەبەو بیر مەكەوە كە كوڕێكی كامل و تەواو لە هەموو ڕوویەكەوە ببێتە هاوسەرت.

دوای بڵاوكردنەوەی كتێبەكەمان خوشكێكی بەڕێز نامەیەكی نارد و بۆچوونی خۆی دەربڕی گوتی ئەم كتێبە بۆ چوونی منی گۆڕیی و مەرجەكانی خۆم كە سەرەتا لە خەیالم بوو زانیم هەلەن، و تەنها خەیال و خەونە، بۆیە هاتمە سەر بڕیاری تۆ كە تەنها ئیمان و ئیسلام بكەمە مەرجی سەرەكیم، گوتی لە خەیالی خۆمدا ئەو مەرجانەم دانا بوو بەتەمای كوڕێكی ئاوا بووم بۆ هاوسەرگیری كە كەسێك بێت چوارشانەو جوان و ڕێک و پێک بێت، چاوی شین یاخود سەوز بێت بیركردنەو ئەقلێكی ڕۆشەنبیری هەبێت دایم جاسوس نەبێ بەسەرمەوە و دەوڵەمەند بێت و خاوەن كاری خۆیی بێت و شەهادەی هەبێت واتا زانكۆیی تەواو كردبێت، ساڵی جارێک بتوانێ بمباتە دەرەوەی وەڵات جا هەر وڵاتێک بێت، نامەوێ كەسێكی دڵ پیس بێت و ڕێگریم لێبكات لەوەی لەداهاتوو خاوەن كاری خۆم بم، و فێری هەموو ئەو شتانەم بكات كە ئەیزانێ

و من نایزانم بۆ نموونە لێخورینی سەیارە و ئەو بابەتانە خانووی سەربەخۆیێ خۆم هەبێت و کەسێکی عیناد نەبێت ڕێگری نەکات لەوەی من هاورێی کورم هەبێت هەر وەک چۆن ئەو هاورێی هەیە و لەگەڵ ئەوەش ڕێگر نەبێت لەوەی من بمەوێ لەگەڵ هاورێ کچەکانم بچمە دەرەوە هەر وەک ئەو لەگەڵ هاورێکانی ئەچێتە دەرەوە، و بەچاوی خزمەتکار سەیری من نەکات.

بەڵێ ئەو قسانەی ئەم خوشکە بیرکردنەوە و مەرجی زۆرینەی کچانی تازە پێگەیشتووە بەتەمان لە داهاتوو فریشتەو پەری ببێتە هاوسەریان و لەسەر بالەکانیان تەواوی دونیایان پێ بسورێنن و بەردەوام لە خۆشی و ڕابواردن بن، ئەم بیرکردنەوانە تەنها خەیال و خەونن بەهیچ شێوەیەك نایەتە دێ لە ژیانی دونیا چونکە ئەم ژیانەی دونیا تەنها تاقیکردنەوەیەکە بۆ ئێمە لە لایەن خوای گەورە بۆ ماوەیەکی کاتی ﴿إِنَّمَا هَذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا مَتَاعٌ وَإِنَّ الْآخِرَةَ هِيَ دَارُ الْقَرَارِ﴾[1] واتە: بەڕاستی ژیانی ئەم دنیایە ڕابواردنێکی کەمە وە بەڕاستی هەر پاشەڕۆژ جێی حەسانەوەی هەمیشەییە.

بۆیە خوشکی من ئەو خەیاڵ و خەونانەی کە سەرەتای هاوسەرگیری لە مێشک و بیرکردنەوەکانت داناون هەڵیان بگرە بۆ بەهەشت، چونکە ئیلا لە بەهەشت ئەو مەرج و داخوازیانە بە دڵی تۆ دەبێت، نەک لە دونیایەکی کاتی کە مرۆڤەکان بەردەوام لە گۆرانکارین و لە ئاستێك ناوەستن و سەدان بەڵێن و پەیمان ئەدەن و نایبەنە سەر، بۆیە دونیایەکی ئاوا جێگای ئومێد و دڵ خۆشی

---

[1]- بڕوانە: سورەتی غافر، ئایەتی: ٣٩

نیە بۆ کەسی ژیر و ئاقڵ ، بەڵام خەڵکی بە دوای دونیا و خۆشییەکانی کەوتوونە و خۆشی و ڕابواردن و هەلاو بەزمی دونیا پەردەی دڵیان داگیر کردوە دەیان ئەوێت نەفس و ئارەزوویان لە خۆشی غەرق بێ.

﴿بَلْ تُؤْثِرُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا﴾[1]واتە: کەچی ئێوە ڕێبازی ڕزگاری ناگرنە بەرو بەڵکو زیاتر ژیانی دونیاتان مەبەستە.

بەڵێ خەم و ئازارەکانمان بۆ ئەوەیە چۆن خۆشی و ڕابواردن ببینین و بەدەستیان بخەین، چۆن شوو بە کوڕێکی دەولەمەند، جوان و قۆز بکەین بێئاگاین لەوەی ئەم ژیانە تەنها ماوەیەکی کەمە و ژیان بەسەر بردن لە دوارۆژ چاکتر و بەردەوامترە لە بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەت بۆ کەسی ژیر و ئاقڵ ئەگەر بزانن ﴿وَالْآخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَى﴾[2]. واتە: لەکاتێکدا قیامەت و بەدەست هێنانی بەهەشت چاکترە و بەردەوامیشە.

بۆیە با هیچ کات بە خۆشیەکانی دونیا هەڵنەخەلەتێین دڵمان پێخۆش بکەین کە وابزانین هەموو شت تەنها بونی پیاوێکی جوان و دەوڵەمەندە و کەشخە و بالا بەرزە و خەیال بکەین هەر بۆ دونیا دروستکراوین هیوای مانەوەی یەکجاریمان پێ هەبێت، کەچی هەرچی بوونی هەیە لە جوانی و دەولەمەندی و خۆشی و خۆشگوزەرانی گشتی کاتین و تێدەپەڕن ئەگەر خۆشبەخترین مرۆڤی سەر زەوی بیت ڕۆژێک دەبێ ملت بەرەو ڕێگای گۆڕەکەت ڕاپێچ بکرێ،

---

[1]- بڕوانە: سورەتی الاعلی ئایەتی: ١٦

[2]- بڕوانە: سورەتی الاعلی ئایەتی: ١٧

﴿مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٍ﴾[1]. واتە: ئەوەی لای ئێوەیە و بە ئێوە بەخشراوە، تەواو دەبێت، بەڵام ئەوەی لای خوایەو هەر دەمێنێتەوە، کە پاداشتی بەهەشتی بەرین و نەبڕاوەیە.

بۆیە ژیانت هەرچەند خۆش و پڕ لەناز و نیعمەت بێت مردن دەبێ جیات بکاتەوە لەگشت خۆشی نازو نیعمەتەکان، بۆیە شەرمە مرۆڤ کە تێگەیشت ئەم ژیانە جێگای ئومێد و مانەوە و خۆشی و هەڵاو بەزم نیە تەمەنی لەپێناو شتێکی کەم بەفیرۆ بدات و خەم و خەفەتی تەنها دونیا بێ و بێئاگا لە قیامەت و مردن و گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە.

﴿فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا﴾[2] واتە: با ژیانی دنیا هەڵتان نەخەڵەتێنێ.

بێگومان لەم ڕۆژگارەدا خۆشی و ڕازاوەی ژیانی دونیا مرۆڤەکانی بە خۆیەوە غافڵ کردووە، وایان لێ هاتووە دوارۆژی بەنرخ و بەهەشتی ڕازاوەیان بیر چووەتەوە، بێئاگان لەوەی مانەوەیەکی کاتی و کەمیان بۆ هەیە بەناچاری دەبێ ڕۆژێک مردن جیایان بکاتەوە، بەرەو ماڵی ئەبەدی گۆڕ ڕاپێچیان بکات، کەوابو گەنجی ئیماندار تاکە خەم و ئاواتیان دەبێ لە دونیا تەنها ڕەزمەندی الله بێت، نابێ وەکو کەسانی جاهیل دوور لە دین بەدوای کەسی تایبەت و نموونەیی بین بۆ هاوسەرگیری واتە لە جوانی وێنەی نەبێ، لە دەوڵەمەندی و سەروەت و سامان بێ حساب هەبێ، لە هێز و کەشخە و باڵابەرزی هاوشێوەی نەبێت،

[1] - بڕوانە: سورەتی النحل ئایەتی: ٩٦

[2] - بڕوانە: سورەتی الاعلی ئایەتی: ٣٣

لە قەوم و عەشیرەت ناوبانگترین بێت، زۆرێک لە گەنجانمان هەڵخەڵەتاون هاوسەرگیری ناکەن تا کەسێکی وایان دەست نەکەوێت، کەچی تەمەنی لاوی وەکو گەلای پایز هەلوەری و هەموو بە فیرۆ و خەساردا و گەورەبووە لە چاوەڕوانی هێشتا ئەو کەسە نەهاتووە بۆیە لە کۆتایی بە ناچاری و بەزۆر لێکردنی دەورو بەری بێت بە کەسێک ڕازی دەبێ لە دڵەوەش بە نادڵی دەبێ بژیت، بە جەستە لەگەڵی دەبێ و بە دڵ و خەیال نا، بەمجۆرە خۆشی و ئاسوودەی دڵی وێران دەکات، کەسی ژیر و ئاقڵ دەبێ بەدوای ئەوە بێ چۆن بەختەوەری بەدەست بێنێ لەژیانی چونکە ژیانی دونیا وەکو گوتمان ئەوەندە ناهێنێ و ماوەنەی کاتی و کەمە، بۆیە گرنگترین شت لە ژیانی هاوسەریەتی قەناعەت و قبووڵکردن و گونجانە لەگەڵ یەکدا، قبووڵکردن و ئارامگرتنە لەسەر کەم و کورتیەکانی یەکتر، چونکە کەسمان بێ کەم و کورتی نین بۆیە دەبێ چاوپۆشی و لێبوردەبین بەرامبەر یەکتر ئەگەرنا ژیانی هاوسەریەتیمان زۆر ناخەیەنێت و سەرکەوتوو نابێت، بۆیە ژیانی هاوسەرییەتی پێش چێژبینین و خۆشی و گشت شتێك لێک تێگەیشتن و ڕێزگرتنی یەکە، ئەم دوو کەسە لە ژیان تێگەیشتوونە بۆیە قبووڵی کەموکورتی یەک دەکەن، بێ ڕێزی بەرامبەر یەک ناکەن و تەبا دەبن، لەگەڵ یەک تاکو پیری و مردن بەخۆشی و ڕێزەوە ژیان بەسەر دەبەن.

## کاتێ کوڕ دێتە داوای کچ باوک و برای چی بکەن..؟

سەرەتا کەسوکاری کچ باوک و برا و دایک، دەبێ خەمی ئەوەیان بێت کچەکەیان بدەن بە گەنجێک کە ئیماندار و یەکخواپەرست، بۆ ئەوەی ئەو گەنجە ساڵح و چاکەکارە نازی کچەکەیان هەڵگرێت و بۆ کچەکەیان ببێتە هەموو کەس و بۆ ئەوەی لە داهاتوو ژیانی کچەیان نەفەوتێ بە ئازار و ژان و هەڵسوکەوتی پیاوی خراپ و جاهیل، هەموو ڕۆژ نەتۆرێ و زیز نەبێ و بێتە ماڵەوە لایان لەدەست خراپی و دڵ ڕەقی پیاوەکەی سکاڵا بکات، دەبێ خەمی داهاتووی کچەکەیان بێت، سوپاسی الله بکەن پاشان مەمنونی ئەو گەنجە ئیماندارە بن کە ئەبێتە هاوسەری کچەکەیان و زاوایان، چونکە کەوتووینەتە سەردەم و ڕۆژگارێکی ئاوا سەخت و ناخۆش و پڕی کێشە و نەهامەتی، کە شتێک بێ نرخ و بێ بەها بێت لای پیاوە جاهیل و نەزانەکان تەنها ئافرەتە، پیاوە نەزان و جاهیلەکان لە پێناو نەفس و حەزو ئارەزووە چلکن و پیسەکانی بە هەموو شێوەیەك ناپاکی و خیانەت دەکات، بۆیە تەنها ئافرەت غەریب دەبێ و دەچەوسێندرێتەوە و بێ کەس دەبێ، ئەوەی دەبێتە قوربانی تەنها ئافرەتە، ئینجا ئەو ئافرەتە ئەزانێ گەر دەنگ بکات لەسەر مافەکانی و خراپ بوونی پیاوەکەی دەبێ بچێتەوە ماڵی باوکی، لەوێش سەد قسەی پێ بگوترێ بۆ دانەنیشتی، بۆ حزت لە مێردبوو و سەرت دەخورا بۆ شووت پێکرد، ئەمانە و دەیان قسەی ناخۆش و ڕووخێنەر و دڵشکێن ڕووبەڕووی ئەو ئافرەت

دەبێتەوە، و یان ناوێرێت هیچ باسی خراپی پیاوەکەی لای ماڵەوەی بکات لە ترسی جیابوونەوە و تەڵاق نەکا منداڵەکانی ببەنە قوربانی دەستی باوکە جاهیلەکەیان.

ئەو خوشکە نامەیەکی بۆ ناردین دوای خوێندنەوەی کتێبەکە چاپی یەکەمان بلاوکردەوە، کە تەمەنی سەروی چل ساڵیەو سکاڵای پیاوەکەی کرد، کە تەمەنی (٤٨) ساڵە و ماوەی نۆزدە ساڵە شووی کردووە، کێشەی خۆی ناوێرێ باسبکات لای کەس نامەوێ کەس بەتایبەت باوک و دایکی بۆ ئەوەی خەفەت نەخۆن، گوتی:

نۆزدە ساڵە بە هەموو شێوەیەک شوکری خوام کردوە، هیچمان نەبو ئێستا خوای گەورە لەفەزلی خۆی هەموو خێرێکی بەسەر ڕژاندووین الحمدلله منیش بەپێی توانا لەسەر شەرعی الله سێ کچم هەیە پەروەردەم کردون هەمویان باڵاپۆش و حیجابی شەرعین سپاس بۆ الله عەبا ئەکەین هیچ کێشەمان نیە، هاوسەرم نوێژ ئەکات، بەلام نە قورئان ئەخوێنێ نە بەدوای فێربوونی زانستی شەرعیە، بەیانیان بە زۆر خەبەری ئەکەمەوە بۆ نوێژی بەیانی، دە جار هەلی ئەستێنم ئەلێ تۆ حەقی منت نەبێ تۆ ناچیتە قەبری منەوە سەرمام ئەبێت، چاوی لە شتی حەرام نا پارێزێ، بگرە هەندێ جار خۆی بەدوایا ئەگەرێت، من الحمدلله لە ئەکادیمیایەکی ئیسلامی دەرسی شەرعی ئەخوێنم زۆر حەزم لە زانستی شەرعیە بەلام هەستەکەم هاوسەرم لەگەڵم گۆراوە هەر بۆی بکرێت زەمم ئەکات، ئینجا ناوێرم یەک نارەزایی دەربرم ئیتر بە دوو هەفتە قسەم

لەگەڵ ناکات، بەڕاستی نازانم چی بکەم پاشان ئیشێک ئەکات بوە بەهاورێی هەندێ کەسی نەشیاو ئەوانیش زۆر گاریگەریان لەسەرە، هیچی لەبەر چاو نیە بەیانی ئەروات بە دوو ڕۆژ و سێ ناهێتەوە، جاری وایە لەگەل هاورێکانی ئەروات بۆ ڕاو و بۆ دەشت تا دووی شەو نایەتەوە، چەندین جار شەو هەستاوم خەبەرم بۆ تەوە لە جێگاکەم نەبوە، کە گەراوم یان لە هۆلەکە سەیری شتی نەشیاوی کردووە، یان چۆتە خوارەوە بۆ گەراجەکە، بە هیچ شێوەیەک نەمداوە لە ڕووی، پاش دوو و سێ رۆژ وتاری مامۆستایەکم لەسەر ئەو بابەتە خەزن کردووە و شەو لێمداوە بۆ ئەوەی گوێی لێبێ و سوود ببینێت، کەچی سوودی نیە ئەو دەڵێت خوا نەی گوتوە بە زیندوویی بچۆرە چالەوە، خۆت لە هەمووشت بگرەوە، تاکو ئێستا دانەنیشتوە یەک ئامۆژگاری ئەم کچانەی بکات، ئێستا ئەوەندە ناحەقی بەرامبەرم ئەکات نازانم چی بکەم، وەلا نازانم براگیان چیبکەم تیدا ماوم نازانم چی بکەم و ڕووم بکەمە کوێ، هەرچی ئەکەم بێ سوودە بەلام سێ کچم هەیە لەبەر ئەوان ناتوانم لەباوکیان دورخەمەوە ئێستا گەورەکەم شوی کردوە دوو کچم ماون یەکێکیان (١٥) سالە یەکێکیان (١٠) سالە کاتێک سەیریان ئەکەم جەرگم قاش ئەبێ نازانم چیبکەم، رۆژی وا هەیە ئەوەنە ئەوەندە خەم دەخۆم و بیری لێ ئەکەمەوە سێ جار خوێنی لوتم بەر ئەبێ ئەترسم شتێکم لێبێت و بمرم کچەکانم سەرگەردان بن، ئێستاکەش ئەو ئەڵێت با کچەکەمان بگوازرێتەوە دواتر لێک جیا ئەبینەوە ژیان واناچێتە سەر لەگەڵ تۆ.

بەڵێ ئەوە ژیانی زۆربەی ئەو كچانەیە كە بوونەتە قوربانی دەستی باوك و دایكەكەی و كە بە زۆر داویانە بە شوو بە كوڕی جاهیل و نەزان و دوور لە ئیسلام، بێئاگا لە حاڵی دڵ و هەستی كچەكەیان كە ناخی سووتاوە بووە بە خەلوز و ڕەش بووە لە بەر ئازار و ژان و خراپی پیاوەكەی، خۆشی كچەكەیان و تەنها و بەس ئاواتی مردنە، چونكە تازە ژیانی دونیای فەوتاوە، ئەگەر جیا ببێتەوە، گەنجی چاكو باش بوونی نیە، و كەس ئامادە نیە بێوەژن و ژنی تەڵاق دراو بهێنێ چونكە لایان وایە ئەو ژنەی جیابۆتەوە خراپ بووە بۆیە پیاوەكەی تەلاقی داوە، بۆیە بەسووك سەیری دەكەن، ئەگەر كەسێك نیەتی ئەوەی هەبێ ژنی تەلاق دراو بخوازێ پێی دەڵێن ئۆۆ كوڕە نەكەی شەرمت بەخۆت نیە چۆن ژنی تەڵاقدراو ئەخوازی خوا ئەزانێ لەسەر چ شتێكی خراپ پیاوە كۆنەكەی تەلاقی داوە، بەم شێوەیە باسی ژنەكە ئەكەن و ژیانی ئەفەوتێت.

یان لەترسی ئەوەی گەر جیاببێتەوە بەهەمان شێوە شوو بە پیاوی جاهیل و نەزان بكاتەوە، یان ناسیاو و دەوروبەری بەژنی تەڵاقدراو و بێوەژنی وەسف بكەن بۆیە ئەو ئافرەتە دەبێ لەلای ئەو پیاوە خراپە بەناچاری بژیت و بەرگەی گشت هەڵسوكەوتە خراپ و ڕەق و توندەكانی بگرێت، لەسەرەوە بە دڵخۆشی خۆی نیشان بدات و لەناخەوەش ئازار هەناوی تەنی بێت و بەردەوام دڵی فرمێسكی خوێنی لێبێ لە تاو خراپی پیاوە نەزان و بێ هەستەكەیدا، بەلام باوك و دایك و براكەی هیچ ئاگایان لەناخ و دەروونی كچەكەیان نیە كە چۆن

لەتاو ئازاری پیاوەکەی خۆشی و بەختەوەری لێ بۆتە دۆزەخ، خۆیان بە ئارەزووی خۆیان دەژین و دەخۆن و دەگەڕێن، براکەی ژنی خۆی هەیە و هەرچی ژنی حەزی لێبێت بۆی دەکات و دەکڕێت، باوک و دایکی ژیانیان خۆشە و بێ کێشەن، و تاکە قوربانی تەنها کچەکەیانە، بۆیە باوک و دایک و برا دەبێ ژیر و ئاقڵ و تێگەیشتووبن خۆشی بەختەوەری کچەکەیان پێش خۆشی خۆیان بخەن، چونکە ناخۆشی و خەم و ئازاری کچەیان هەر دەبێتە خەم و ئازاری خۆیان لە داهاتوو، و کچەکەیان بەشێکە لەوان و لە ڕەحم و سکی وان لە دایک بووە، بۆیە دەبێ سەرەتای بەشوودانی کچەیان زۆر ژیر و ئاقڵ بن، و بزانن کە خۆشی و بەختەوەری کچەکەیان تەنها لای کوڕی ئیماندار و تەقوادار دەستەبەر دەبێت، بۆیە دەبێ خەمی کچەکەیان بێ و ژیانی دونیا و دواڕۆژی لێ نەفەوتێ و پێشکەش بەگەنجێکی بکەن عەقیدەی پاك و سەلامەت بێ و دووربێ لە هەواو ئارەزووی دونیایی و دواکەوتنی نەفسی سەرکەشی، و دوای ڕێگای شەیتان و کە ئیسلامی نەناسیبێت بەڕاستی، چونکە ئێستا ئیسلامی ڕاستەقینە بەو شێوەی پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ پێی گەیاندوین نامۆیە، جێبەجێ کردنی ئەو ئیسلامە لای خەڵکی بە توندڕەو کەسی داخراو دادەنێرێت، و ئەوانەشی دەست بەو ئیسلامەوە دەگرن بەو شێوەی الله تعالی پێی ڕازیە نامۆی ناو خەڵکن، و کەمینەیەکن دەستیان بە ڕێگای حەقە و گرتبێت.

ئەگەر ئێمە خۆمان ئیسلامان ناسیبێت بەو شێوەی الله پێی ڕازییە، بەڕاستی ئەوکات شوێنکەوتوانیشی دەناسین و دەزانین کامە موسڵمان عەقیدەی چاکەو پاکە، کامەش گومڕاو و سەر لێشواوە، بۆیە داوام وایە لە باوک و براو دایکان با هەوڵدەین خەمی ناسینی ئیسلام و خۆفێرکردنی شەریعەت و بەرنامەی الله بدەین بەو شێوەی الله پێی ڕازییە پاشان پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ پێی گەیاندوین تاکو حەقیقەتی هەموو شتێکمان بۆ ڕوونبێتەوە، کەسی چاک و خراپ بناسین و ڕێگای حەق و ناحەقمان بۆ دەرکەوێت.

ئێستا زۆر گەنج هەیە بۆ ئەوەی کچی پێبدەی دەڵێ من عەقیدە و بیروباوەڕم پاکەو تەنها لەسەر بەرنامەی ئیسلامم بەلام لەڕاستیدا وانیە و لێبکۆڵیتەوە دەمارگیری و خۆشویستن و بەرگری کردنی بۆ کەس و شێخ و مەلاو گرووپی گومڕا هەیە.

هەر کەسێک یەکخواپەرست نەبوو و بە تەواوی لە ئیسلام حاڵی نەبوو مانای وایە کەسێکی سەرکەوتوو نابێ لە ژیانی چونکە بەهەڵە و نەزانین لە ئیسلام تێگەیشتووە، ئیسلام مرۆڤ دەکاتە کەسێکی ژیر و ئاقڵ و تێگەیشتوو، بۆیە گوتنی من موسڵمانم بەتەنها بەس نیە و جێگای باوەڕ و متمانە نیە تاکو نەزانی عەقیدەو بیروباوەڕی محمدییە ﴿ﷺ﴾ و لەسەر ڕێبازی راستەقینەی ئیسلامە.

بۆیە باوک و دایکی من هەرکات ئەو کوڕەی دێتە داوای کچت دەتوانی لێی پرسی دەربارەی کەسێک کە خۆت دەیناسی و یەکخوا پەرست و عەقیدە پاکە ئایە فلانە کەس دەیناسی؟

گەر گوتی بەڵێ ئەوکات برۆ لەو کەسە بپرسە کەخۆت دەیناسی و پرسیاری لێبکە فڵان گەنج هاتۆتە داوای کچمان ئایە عەقیدەی چۆنە و ئەخلاق و ڕەوشتی چۆنە و ئایە بەڕاستی ئیسلام و بەرنامەی الله ی خۆشدەوێت لە گشت شتێک و گیان و ژیانی خۆی، سەر ڕاستانە پەیوەستە بە قورئان و سوننەتەوە، وە دەبێ ماڵەوەی کچە بۆ ئەوەی بەڕاست و دروستی دەرکەوێت ئەم کوڕەی داوای کچەکەیانی کردووە ئایە چۆنە لە ڕووی ئیمان و ئەخڵاقەوە، دەبێ لەکەسی دڵسۆز و ئیماندار بپرسن، لە هاوڕێی نزیکەکانی کوڕەکە بپرسن، کە تێکەڵاویان هەبووە لەگەڵ کوڕەکە، نەک بچن لە گەڕەک و دراوسێ کانی هەر کەسێکیان بەرچاو کەوت بپرسن، کە دوور و نزیك نازانن کەسێکی چۆنە، زۆرجار هەبووە جیرانەکان کەیفیان بەو ماڵە نەهاتووە، لە کۆنەوە کێشەیەکیان هەبووە بۆیە لە ڕقان کاتێک لەوانیان پرسیووە کوڕی فڵان و ماڵی فڵان چۆنن، دەیان بوهتانیان بۆ کردوونە، ڕاستگۆ نەبوونە لەوەی بڵێن کوڕەکە چۆنە، خەڵکی زۆرینەی جاهیل و نەزانن بە دینی ئیسلام، دووبەرەکی و مونافیقی و دووڕووی لە نێویان بڵاوبۆتەوە، کەس کەیفی بەکەس ناهێت و هەموو ڕقیان لە یەکترە، کە دەبینن کوڕ و کچی خۆیان ماوەتەوە و نەچوونەتە ژیانی هاوسەری و کوڕ و کچی خەڵک شوو دەکەن و ژن دەهێنن پێیان ناخۆشە و لە دڵەوە حەز ناکەن، بۆیە کاتێک باوک و برای کچە لێیان دەپرسن دەربارەی فڵانە کوڕ و ماڵەکەی، ڕاستگۆیانە وەلامیان نادەنەوە، لە ڕقان حەز دەکەن هەموو کوڕ و کچێ بمێنەوە و شوو نەکەن

وەکو منداڵەکانی خۆیان، بۆیە باوک و برا و کەسی کچە نابێ زوو بەقسەی خەڵکی جاهیل و نەزان هەڵبخەڵەتێن و باوەڕ بکەن، گەنجێک دەناسین زۆر تەقوادار و ئەهلی ئیمان و پابەند بووی بە یاسای ئیسلام، ڕۆیشتبوویە داوای کچێک، کە کەکچە ئیماندار و موحید و یەکخواپەرست بوو، زۆربەی قورئانی لەبەر بوو، بۆیە کوڕ و کچە زۆر یەکیان بەدڵ بوو، و کچەکە زۆر گریا بوو بۆ کوڕەکە، بەس ماڵەوەی ئەو کچە جاهیل و نەزان بوون، ڕۆیشتبوون لە گەڕەکی گەنجەکە لەو گەنجە و ماڵەوەیان پرسی بوون کوڕی چۆنە و ماڵەوەی چۆنە، ئەو خەڵکەش گوتبوویان، کوڕێکی توندڕەوە و سەدان بوهتانیان بۆ کردبوو، لە کاتێکدا ئەو گەنجە تاوانی تەنها ئەوە بوو کە بەس بەندەی اللهیە و دوورە لە هەموو گرووپ و ڕێگا پوچ و باتڵەکان، پابەندی ئەو ئیسلامەیە کە الله پێی ڕازیە و دوورە لەوەی ئیسلام جێبەجێ بکات بە حەز و ئارەزووی خۆی و فلان و فیسار و حیزب کە ئیسلام بە ئارەزووی خۆیان پەیڕەو دەکەن، لە سەر ئاکار و ڕەوشتی پێغەمبەری ئازیزە ﷺ و سوننەتەکانی جێبەجێ دەکا و ڕیش دەهێڵێتەوە و سیواک دەکات، خەڵک پێی دەڵێن توندڕەو و داخراو، ئاخر توندڕەوی لە چیدایە، بەڵام خەڵک جاهیلن و زۆرینەی خەریکی خۆشی دونیا و ڕابواردنەکانیەتی،

﴿يَعْلَمُونَ ظَٰهِرًا مِّنَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ ٱلْءَاخِرَةِ هُمْ غَٰفِلُونَ﴾[1] واتە: لە شتە ڕووكەشیەكانی دونیا لە پەیداكردنی بژێوی و مەعیشەت شارەزان بەڵام لە ژیانی كۆتای ئاخرەت بێ ئاگاو و جاهیلن.

بۆیە جاهیل و نەزانن بەو ئیسلامەی الله پێی ڕازییە، تەنها خەریكی ژیانی دونیا و هەڵاو بەزمن، هەر كەس سەر ڕاستانە دەست بە ئیسلامەوە بگرێت لای ئەوان بە نامۆ و توندڕەو وەسف دەكرێت.

دەبێ تەنها لە كەسە دڵسۆز و پاكەكان بپرسن چونكە تەنها ئەوان ڕاستگۆ و بەڕەحم و سۆزن و خۆشی و بەختەوەری ئیماندارانیان پێش خۆشی خۆیان دەوێیت.

ئەوجا كە دەركەوت بەڵێ گەنجی یەكخواپەرست و ئەهلی ئیمانە ئەوكات لێی ئەمین بە و كچەكەت هەر بەدیاری و بەكراسی ماڵەوە پێی ببەخشە پەشیمان نابیتەوە لە خراپ بوونی، و لەوەی كچت پێداوە، چۆن سۆزو و ڕەحم و میهرەبانی تەنها لای بەندە دلسۆزە سەر ڕاستەكانی ئیسلامە، بۆ كچەكەت دەبێتە هەموو كەس و بەختەوەری دەكات و سەرنجام بەیەكەوە ڕەزامەندی الله بەدەست دێنن و بەهەشت دەبێتە شوێنی هەمیشەییان بە ئیزنی الله تعالى.

[1] - بڕوانە: سورەتی الروم ئایەتی: ٧

## هاوفیكربوون گرنگترین شتە بۆ هاوسەرگیری.

سەرەتا پێش هەموو شتێک ئەبێ ئەو ڕاستیە بزانین، کە ئەو ئافرەتانەی گڵەی و گازندەی ئەوە ئەکەن کە پیاوەکانیان سەرەتا هەڵیان خەڵتاندون، بەوەی کە کەسی چاک و ئیماندارن، بۆیە پێیان ڕازی بوونە. کەچی چوونەتە ژیانی هاوسەریەتی لەگەڵیان جۆرێکی تر بووە و ژیانیان بەختەوەر و سەرکەوتوو نەبووە و بەردەوام شەڕ و ئاژاوە و ناخۆشی بووە.

بۆیە کە دەڵێن گەنجەکان هەلیان خەڵتاندووینە بەناوی موسڵمانیەتی پێم وایە ڕاست ناکەن لەگەڵ ئەو قسەیان، چونکە زۆربەیان لە هەڵبژاردنی پیاوەکانیان ڕاستگۆ نەبوونە کە تەنها ئیمان و تەوحید مەرجی سەرەکییان بێت، هەر بۆیە خوی کچەکان وایە سەرەتای تەمەنی گەنجیان عاتیف و خۆشباوەڕن هەر کە زانیان کوڕی جوان و کەشخە و قۆز هاتۆتە داوای بەبێ ئەوەی بزانێت عەقیدە و بیروباوەڕی چیە، یەکسەر ڕازی دەبێت، پاشان هەموو موسڵمانێک خۆی پێ دیندار و کەسی چاک و پاکە، پاکانە بۆخۆی دەکات بەتایبەت بۆ وەدەست هێنانی مەسلحەتێکی دونیایی، تاکو بەدەستی دەهێنێ، لەو پێناوەدا هەرچی قسەی چاکە و باشە بۆ پەردە پۆشکردنی خۆی بەکار دەهێنێ و خۆی پێ دەڕازێنێتەوە، تاکو کچە و ماڵی کچە ڕازی دەکات، بۆیە لای کچە وادەر دەکەوێت باشترین گەنجە و پاکترین کوڕە، کەچی

دەڕواتە ژیانی حەقیقی وانیە، نازانێ تەحامول و ڕێز و ئارامگرتن چیە، تورە و توند و دڵپیسە، و بێ هەستە، بۆیە ئەو ئافرەتە بە کچە هاوڕێ و ناسیاوەکانی ئەڵێت نەکەن شوو بکەن توخوا، خۆزگەم بە ئێوە شووتان نەکردووە، باوەڕ بە کوڕ مەکەن هەموو درۆزن و دووڕوون، بەچاوی خراپ لە پیاوەکەیەوە سەیری گشت کوڕێک دەکات، لای وایە هەموو کوڕێک بەمشێوەی مێردەکەی خراپە، هۆکاری سەرەکی ناخۆشی ژیانی کچەکان هەر خۆیانن کە پێش شووکردنیان زۆر بە زووی باوەڕ بە کوڕ ئەکەن، بەناوی موسڵمانی هە ڵدەخەڵەتێن دایکی من خوشکی بەڕێزم ئەمە ژیانە دونیایە و مرۆڤەکان گشت ڕێگایەک دەگرنە بەر بۆ ئەو مەبەستەی دەیانە ئەوێت پێی بگەن.

هەر وەکو قوتابی تەمبەڵ، بۆ ئەوەی دەربچێت لەو قۆناغەی تێیدایە، بگاتە ئاواتەکەی دەیەوێت بە فێل و خەش و غیانەت پاکانەی زیرەکی بۆخۆی بکات، هەرچی ڕێگایە بەکاری دەهێنێ بۆ ئەوەی ڕزگاری بێت و قۆپیە بکات، تا بە هەر جۆرێک بێ نمرەیەک بێنێ و دەربچێت، و بڕوانامەکەی لەبەر چاوی خەڵکی بۆ لەخشتە بردنیان بە کاربێنێ، بڵێن ئۆ فڵانیش ئەو بروانامەیە هەیە.

کاتێکیش دەرچوو هیچ زانیار و زانستێکی نیە بە بەشەکەی خۆی، ئەگەر لە شوێنێک دامەزرێت بۆ کارکردن بەنازانین و جاهیلی و بەدڵسۆزی کار ناکات، کاتێکیش باسی دەکەن دەڵێن کورە کاکە فلان ئاوا و ئاوایە خاوەن شەهادە و بڕوانامەیە، لە ڕاستیشدا وانیە، دڵپیس و خراپ و درۆزن و خیانەت کارو پیشەکەیەتی.

بۆیە زۆرجار هاوڕێ و ناسیاوێکی کچە، بۆ ئەوەی شوو بکات پێ دەڵێت وەرە شوو بەمە بکە وێنەی کوڕێک نیشانی کچەکە دەدات، کە نازانێ لە کوێ ناسیویەتی لە وێنەش هەموو کەسێک قۆز و کەشخە دەرئەکەوێت، کەسێک ڕوو بەڕوو بیبینی و لە وێنەش ببینی زۆر جیاوازە، ئێستا دەیان بەرنامە و ڕێگا هەیە بۆ جوانکردنی وێنە، سناب و بەرنامەکان تەواوی ڕووخساری کەسەکە دەگۆڕێت، بۆیە کاتێک کچەکە وێنەی دەبینێت دەڵێت بابێتە پێش من ڕازیم و بە دڵمە، تەنها بە وێنەیەک ڕازی دەبێت و لایماڵەوە لە پێناو وێنەکە کە چۆتە دڵی دەڵێت من ڕازیم و هاوڕێکەم ئاوا و ئاوا وەسف و مەدحی کوڕەی بۆ کردم کەسی چاک و بە ئەخلاق و ئیماندارە، سەرەڕای ئەوەی پێش هەموو شتێك بزانێت کوڕەکە عەقیدە و بیروباوەڕی چۆنە، چونکە گرنگترین شت لە ژیانی مرۆڤ و بەتایبەت موسڵمان عەقیدەو بیرو باوەڕە، گرنگترینیش تەوحید و بەیەکدانانی خوای گەورەیە بەسەر گشت خوایە پوچ و باتڵەکان، کە ئەم ڕۆژگارە مرۆڤایەتی دەیان خوا دەپەرستێت، بت و سەنەم و دارو بەرد بەتەنها پەرستنی شیرک و کوفر نین بەڵکو دەیان جۆری تری پەرستن هەیە، مرۆڤ هەیە دەمار گیرەو سەرۆک و شێخ و فلان و فیسار دەپەرستی و حیزب و گرووپی گومڕاو لادەر لە ئیسلامی ڕەسەن و حەقیقی دەپەرستێت، پەرۆک و ئاڵا و والا دەپەرستێت، یاسا و ڕێسای غەیری ئیسلام دەپەرستێت، ئەمانە لەگەڵ خوێنی تێکەڵ بوونە و ئامادەیە گیانی لە پێناویان بکاتە قوربانی، بەڵێ ئەمانە و دەیان جۆری تری پەرستن مێشک و فیکری داگیرکردوون، بۆیە ئەم

جۆرە کەسانە لە ئیسلام تێنەگەیشتوونە و شارەزا نین بە چۆنیەتی ژیان بەڕێوەبردن و گونجاندن لەگەڵ دەورو بەرو و هاوسەرانیان، بۆیە گرنگترین شت شارەزابوونی عەقیدەیە، کەوایە خوشکانم هەر کات وویستتان شوو بکەن و ژن بێنێن پرسیاری یەکەمتان با ئەوەبێ کەسەکە عەقیدەی چیە، ئایە بەڵێ خۆی یەکلاکردۆتەوە بۆ الله و دوورکەوتۆتەوە لەگەشت خوایە باتڵەکان و بەتەنها بەندەو عەبدی خوای پەروەردگارە، ئەوکات پرسیتان بۆتان دەرکەوت بەڵێ وایە گەنجی ئیماندارە، و موحیدە ئەوکات دڵنیابە لە داهاتووت پەشیمان نابیتەوە لەگەڵ ئەو گەنجەدا، چونکە هەر کەسێک گوتی موسڵمانم ئەوە مانای ئەوە نیە کە ئیماندارە، چونکە ئیماندار و موسڵمان زۆر جیاوازن، هەموو ئیماندارێک موسڵمانە، بەڵام هەموو موسڵمانێک ئیماندار نیە و خاوەن تەوحید و بیروباوەڕێکی پاک و چاک نیە، بەڵام هەموو ئیماندارێک ئیمان چۆتە دڵی و تەواوی لاشەی گرتۆتەوە، ئەمجۆرە ئیماندارە ڕاستگۆن و خاوەن بەڵێن و پەیمانن.

نمونەی ئەم جۆرە ئیماندارە لەگەڵ یەکتر و بەیەکەوە ژیانی دونیا ئەکەنە بەهەشتی سەر زەوی، بۆیان باسکردووم کە نمونەی ئەم جۆرە ئیماندارە یەکخواپەرستانە ئەوەندە گرنگی بەیەکتر ئەدەن و یەکیان خۆشدەوێت، پیاوەکەی تەنها بەخێر هاتن لە خوشکی خێزانی دەکات هیچ قسە و گوفتارێکیان لەگەڵ ناکات، واتە غەیری خێزانی خۆی هەتا لەگەڵ خوشکەکانی خێزانی قسە ناکات و لەگەڵ هیچ کچی نامەحرەم قسەی نیە

تەنها و تەنها گرنگی بە خێزانی دەدات، ئافرەتەكەش بەهەمان شێوە قسە لەگەڵ كوڕە مام و خاڵ و برای پیاوەكەی ناكات تەنها و تەنها پەیوەندی بە پیاوەكەی خۆیەوەیە، بەكورتی و پوختی بۆ یەک دەژین و بۆ یەک دەمرن، هەموو قوربانیەک لە پێناو دڵخۆشكردنی یەكتر ئەدەن، ئەمەش مانای ئەوەنیە تووندبن بەڵكو خۆشەویستی و ڕێز و وەفا و قوربانیدانە بۆ یەكتر، نەک یەكتر ئیهماڵ بكەن و لای میوان گاڵتە و پێكەنین و سوبعەت لەگەڵ نامەحرەمەكان بكەن و ژنەكەی خۆی ئیهمال بكات، و بێ هەست بن بەرامبەر یەكتر.

ئەم گرنگیدان و خۆشویستنەیان بۆ یەكتر هەموو لە سەرچاوەی ئیسلام و تەوحیدەوە سەری گرتووەو بەرهەمی هێناوە كە ئەوان هەردووكیان عەقیدە و بیروباوەڕیان وەكو یەكە و بەتەنها بەندەی اللهن و دوورن لە حیزب و گروپە گومڕاو سەرلێشواوەكان.

بۆیە گرنگترین شت بۆ كوڕ و كچ هاوبیروباوەڕبن و هاوفیكری یەكتر بن، واتە نابێت یەكێكیان بیروباوەڕی حیزبی بێ و یان عەلمانی بێت و یان كوڕەكە بلێت با سفور بێت من دواتر دەیكەمە باڵاپۆش و حیجاب، زۆرێک هەبوون لە كچەكان نیقاب و عەبا بوون شوویان بە كوڕی عەڵمانی و جاهیل بە ئیسلام كرد گوتیان كوڕەكە دەكەینە ئیماندار، كەچی خۆیان وازیان لە نیقاب و عەبا هێنا، و ئێستا بوونە سفور و پانتۆڵ و جلی نمیچە ڕووت دەپۆشن، پەنا بە الله تعالی.

بۆیە کەس مەکە بەهاوسەرت تاکو بە تەواوی ئەمین نەبی لە دین و ئیمان و مەنهەجەکەی.

ئەوەتا عمرانی کوڕی حتان یەکێک بوو لەپیاوانی ئەهلی سوننە و خاوەن زانست و زانیاریکی زۆر، بەئافرەتێکی خەوارجی سەرسام بوو، واتا دەسەڵات و سەر گەورەکانی بەکافر دەزانی وە خاوەن جوانیەک بوو ئەم پیاوە ویستی زەواجی لەگەڵ بکات!

پێیان گوت کەوا عەقیدەی باش نیە و پێچەوانی ئەهلی سوننەیە...!!!

عمرانیش گوتی: ئەیگەڕێنمەوە سەر مەنهەجە ڕاستەکە دوای ئەوەی زەواجم لەگەڵ کرد..

بەڵام بە پێچەوانەوە عمران چووە سەر فکری خێزانەکەی، بوو بەیەکێ لە گەورەکانی خەوارج ...!!!

**(تزوج عمران ابن حطان خارجيه وقال: سأردها، قال: فصرفته الى مذهبها)**[1]

بۆیە زۆرینەی کێشەکانی هاوسەران هۆکاری بیروباوەڕ و عەقیدەیە، کە کوڕ و کچ هاوفیکرنین، بەو هۆکارەشەو لەیەکتری تێناگەن، دەبێ تەواوی ژیانی لەگەڵ بەسەر ببەی بەوەی فەرمانی پێ بکەی وابکە وامەکە کەچی هیچ تێناگات و تێناگا، برایەکی چاك و ئیماندار هاوڕێمە و زۆر چاك ئەیناسم و لە هیچی کەم نیە سەیارەی مۆدیل نوێ و خانوو و مامۆستای زانکۆیە، خاوەنی

[1]- بڕوانە: سير أعلام النبلاء - _٢١٤_٤

خێزان و سێ منداڵە، قسەم بۆ دەكرد گوتم تۆ الحمدلله دەبێ زۆر شوكرانە بژێوتربی لەمن، كە خاوەن ئیش و ماڵ و منداڵ و ژنی خۆتی كەچی من خاوەنی هیچیان نیم، گوتی وایە ڕاستە سپاس بۆ الله، بەس با منیش پێتی بڵێم كە چەن ڕۆژێكە ژنەكەم تەڵاق داوە و لێی جیابوومەتەوە، تووشی شۆك بووم كاتێك وای گوت، گوتم توخوا بۆ ئەی منداڵەكانت چی، گوتی كاكە گیان والله لە پێناوالله تەڵاقم دا ئەوە یازدە ساڵە لەگەڵی ئەژیم و پێكەوە بووین، سەرم پێیەوە سپی بوو هیچ لێم تێنە دەگەیشت و ئامۆژگاری وەرنە ئەگرت لای من و لە پێش چاوم نوێژی ئەكرد و بەتەنها نەی ئەكرد و لای من حیجاب و خۆی دائەپۆشی و دەچوویەوە ماڵی باوكی خۆی سفور ئەكرد لە پێش چاوی خەڵك، هیچ ئامۆژگاری وەرنەئەگرد، بۆیە ماندوو بووم و تەڵاقم دا، زۆرم پێ سەیربوو چونكە مامۆستای زانكۆ لە هیچی كەم نەبوو جوانترین مۆدێلی سەیارەو خانوی خۆش و سێ منداڵ ئینجا تەڵاقی داوە و ژیانەكەی هەڵوەشاندۆتەوە، بۆیە گرنگترین شت بۆ بەختەوەری ژیانی هاوسەریەتی ئەوەیە كچ و كوڕ عەقیدەیان پاك و سەلامەت بێ و لەسەر قورئان و سوننەت و ئیسلامی ڕەسەن بن، ئەوكات بە ئامۆژگاری یەكتر و گوێنەگرتنی یەك ماندوو نابن هەمووشت ئەزانن و خراپ و چاكیان ناسیوە و ترسی الله لە دڵیانە و بێ فەرمانی الله ناكەن پاشان گوێڕایەڵی یەكتر دەبن، و ژیانێكی خۆش و بەختەوەر بۆ یەكتر دەستەبەر ئەكەن و لە دواڕۆژیش بۆ هەمیشە لە بەهەشتی پان و بەرین بەیەكتر شاد ئەبنەوە، بە ئیزنی الله تعالی.

# كچی ژیر و ئاقڵ ، لە گەنجی دیندار دوودڵ نابێ

ئـەی خوشـكی مـن، ئـەی ئـەو كەسـەی هیـوا و ئاواتـت لـە ژیـانی دونیـا تـەنیا ئەوەیـە، بـۆ ڕەزامەنـدیی خـودا بژییـت، كاتێـک بەتـەمای هاوسـەرگیرییت، پێویسـت ناكات خـۆت قەلـەق و ڕاڕا بكـەیت و بترسـێیت، چونكـە ئێـوە دەچنـە ژیـانێكی تـر، ئەگـەر لێ بـزانن و بڕیـارێكی ژیرانـە بـدەن دەیكەنـە بەهەشـت و ئەگەرنا دەبێتە دۆزەخێكی سەخت، وەكوو گوتمان دەبێت لێ بزانین چۆن ژیان بەڕێ دەكەین، ئەگەر لە سەرەتاوە لێمان زانی چ كەسێک هەڵدەبژێرین، ئایا دیـن و ئـەخلاق و تـەقوا دەكەینـە مـەرجی سـەرەكی یـان مەرجـە دونیاییـەكان، بۆیە ئەگەر هەر دوو لا كوڕ و كچ دیندار و تێگەیشتوو بوون، دەبنە ڕووناكیی یەكتر بۆ شەوەزەنگ و ڕێگە سەخت و تاریكەكانی ژیان.

بەڵام بە داخەوەم خوشكانێک كە خۆیان پێ دیندار و لەخوداترس و تەقوادارە، كاتێک داواكاریان دێت بۆ هاوسەرگیری، كوڕەكە ئەگەر دیندار و یەكخواپەرستیش بێت، ناتوانن بڕیاری دڵنیایی بدەن كە ڕازی بن!

شوو بەم گەنجە بكەن؛ زۆرێكیان هەڵخەڵەتاون بە هاوڕێ و خزمە جاهیلەكانیان، كە دەبینن ئەوان لە ڕۆژی مارەیی و گواستنەوە بە ئاهەنگی گەورە و كێكی گەورە و جلی بووكێنییەوەن، بۆیە ئەوانیش ئاوات بە پیاوی ئاوا دەخوازن، ئەگەرچی كوڕەكە جاهیلیش بێت، تەنیا لەپێناو جوانی و دەوڵەمەندی، بۆیە گەنجی دینداری هەژار دێتە داوایان قەلەق و دوودڵن،

پاشان تەمەنیان بەسەر دەچێت و گەورە دەبن لە داهاتووشدا پەشیمان دەبنەوە و، قەیرەیی ڕوویان لێ دەکات.

دەبێ ئەم خوشکانە بزانن، کە تەنیا فێڵلەخۆکردن و خۆهەڵخەڵەتاندنە، چەندان خوشک هەن، لەوانەیە دە گەنج زیاتر ڕۆیشتبێتە داوای بۆ هاوسەرگیری، کوڕەکە هیچ کێشەی دین و ئەخلاقیی نەبووە، واتە موحید (یەکخواپەرست) بووە، کچەکە لە دین و ئیمانی ئەو کوڕە دڵنیا بووە کە موحیدە و کوڕی چاک و بەتەقوایە، بەڵام گوتوویەتی ناتوانم خاوەن بڕیار بم و، دوودڵم لە بڕیاردان.

بە داخەوە زۆرێک لە خوشکان کاتێک داواکارییان دێت بۆ هاوسەرگیری، تووشی قەلەقی و ڕاڕایی دەبن، ناتوانن بڕیاری دڵنیابوون بدەن و، بەسەر حەزی دونیای دڵیان زاڵ بن، واتە: خاوەن بڕیاری خۆیان نین، چەندان نموونەمان بیستووە و بینیووە، کە کچی وا هەیە پازدە تا بیست داواکاری هاتوون هەمووی گەنجی دیندار و ڕەوشتبەرز بە ئەخلاقی ئیسلام و گەنجی موحید (یەکخواپەرست) بوونە، کاتێک کوڕەکە ڕۆیشتووە بۆ ماڵی کچە یەکتریان دیوە، هیچ کێشەی نەبووە، لە جوانی و کەشخەیی سەرەڕای دینداری و یەکخواپەرستی کوڕەکە، سەرەتا ڕازی بووە، بەڵام ڕۆژی دواتر پەشیمان بووەتەوە، دایکی بەڕێزیان گوتوویەتی بێزار بووم لە کچم ئەوەندەی کوڕی باش ڕەت بکاتەوە!

یان بەبیانووی ئەوەی دڵیان ڕەق و تەنگە و بۆ ئەو کەسەی هاتووەتە داوای بۆیە یەکسەر بەپەلە ڕەتی دەکاتەوە، هۆکاری دڵتەنگیش جوانی و کەشخەیی و باڵابەرزییە بۆیە دڵیان تەنگە، دەبێ کوڕ و کچ کە زانییان ئەو کەسەی داوای

كردووە دیندارە و یەكخواپەرست و موحیدە با یەكتری لەدەست نەدەن و بەبیانووی ئەوەی دڵیان ڕەقە خۆیان دڵتەنگ نەكەن؛ تۆ ڕاستی و حەقیقەتی كوڕەكە یان كچەكەت بۆ دەركەوتووە، كە یەكخواپەرست و دیندارە، ئەوەی گرنگە تەنها ئیمانە خۆشبەختی بە ژیان ئەبەخشێ، بۆیە پێویست ناكات خۆت تووشی نەخۆشیی نەفسی بكەیت و ڕاڕا بیت، نەزانیت چ بڕیارێک دەدەیت، چەندان برای دیندار گوتوویانە چووینەتە داوای كچ سپاس بۆ خودا عەقیدەمان پاكە و تەنیا لەسەر قورئان و سوننەتین، كچەكە و ماڵەوەی كچە لە ئەخلاق و ڕەوشتی پرسیوین بێكێشە بووە، ئیشەكە تەواو بوو و، گەیشتبوویە سەر مارەبڕین، دواتر خانم گوتی: "نوێژی ئیستیخارەشم كردووە، هەر دوودڵ بوومە!"

كێشەكە ئەوەیە هەمووشی دەكەنە ئەستۆی سوننەتی ئیستیخارە!

ڕەحمەتت لێ بێت، تۆ كاتێک زانیت كوڕەكە یان كچە دیندارە و پرسیت لە ناسیاوەكانی، بۆت دەركەوت كەسی تەقوایە و خەڵک شاهێدیی چاكەیان بۆ ئەو كەسە دا، ئیتر پێوێست ناكات مێشكی خۆت ئاڵۆز بكەیت و، خۆت بخەیتە حاڵەتێكەوە كە نەزانی چ بڕیارێک دەدەیت، تۆ ئەگەر بترسیت لەگەڵت خراپ دەبێت، ئەوە تۆ هەڵەیت، چونكە هەر گەنجێک (هەر پیاوێک) بەڕاستی لە دونیا حاڵی بوو كە ژیانێكی كاتییە و خۆی ڕادەستی خودا كرد، ئەو كات زەرەری بۆت نییە و زووڵمت لێ ناكات، وەكوو لەسەرەوە باسی ڕەحم و سۆزی ئیمانداارنمان كرد، كە چۆنن بۆ یەكتر.

بۆیە خوشكی من؛ تۆ، كە لە حاڵەتێكی شێواو و ئاڵۆزدایت، دڵت دەترسێ لەوەی ئەو كوڕە خراپ بێ و نەتوانی لە ژیاندا لەگەڵی سەركەوتوو بیت، كاتێک

كە سوننەتی ئیستیخارەش دەكەیت هەر قەلەق و دوودڵیت، چونكە هەواڵ و شتێكی بەپەلە و لەناكاو هاتووەتە پێش ژیانت و، دڵت دەترسێ و پەلەپەلیەتی، بۆیە ناتوانی كۆنترۆڵی خۆت بكەیت و بڕیارێكی جددی بدەیت، یەكسەر ڕەتی دەكەیتەوە، لەم حاڵەتی دڵەڕاوكێ و نائارامییەدا دەچی بەپەلە دوو ڕكات سوننەتی ئیستیخارە دەكەی و دواتر هەر دڵت نائارام و دوودڵە، ناتوانی بەسەر دڵتدا سەركەویت.

بۆ نموونە بەبێ پرس ڕۆژێك میوانێكت دێ، لەناكاو بە ماڵەوە دەكەون، كاتێك دەبینی، تووشی شۆك دەبیت لە میوانەكە چونكە ئاگاداری نەكردبووی بۆ ئەوەی كە دێتە ماڵەوەت، بۆیە زۆر بێتاقەت و دڵتەنگ دەبی، كاتی دروستكردنی خواردن نەماوە و درەنگە بۆ ئەوەی خواردنێكی خۆش دروست بكەیت، بۆیە هەر خواردنێك بەپەلەپەل دروست بكەی، لەوانەیە خۆش دروست نەكەی، بەس ناچارییە بۆ ئەوەی شەرمەزار نەبیت، بۆیە كاتێك داواكاریت دێ بۆ هاوسەرگیری نازانی چی بكەی، هەر دوودڵ دەبی و ترس و دڵەڕاوكێ بەسەرتدا زاڵ دەبێت.

بەڕێزم (خوشكی من)، لەپێناو خودا لەخەمتداین، چونكە گەنجانێكی نموونەی ئەهلی تەوحید و ڕاستگۆ و پاك حەیفە و زووڵمە ڕەتیان دەكەیتەوە، ژیانی خۆشی و بەختەوەریت دەفەوتێنی لەپێناو حەزە دونیاییەكانت، ئارام بگرە و بیر لە چاكی و ئەخلاقبەرزیی ئەو گەنجە بكەوە، لەوانەیە جارێكی تر گەنجێكی ئاوا نەهێتەوە داوات و لە دوارۆژدا باجی ئەم هەڵەیە بدەیت.

لەپێناو خودا پێمان خۆشە پیاوێكت هەبێت بەڕاستی پیاو بێت و بە هەرچی لە دونیایە نەتگۆڕێتەوە، ژیانت نەكاتە دۆزەخ بەڵكوو بەختەوەر بژییت.

خوشکم، هەڵبەت سوننەتی ئیستیخارە واجب و فەرز نییە، هەروەکوو سوننەتەکانی ترە، وەکوو سوننەتی بەڕۆژووبوونی دووشەممە و پێنجشەممە، سوننەتی دەستنوێژ -کاتێک دەستنوێژ دەشۆی دوو ڕکات سوننەت هەیە-، یان سوننەتی ویتر، ئەمانە و دەیان سوننەتی تر کە زۆربەمان فەرامۆشمان کردووە و نایکەین، بەڵام کاتێ دێتە سەر باسی هاوسەرگیری بەقەلەقی و ڕاڕایی دوو ڕکات نوێژی ئیستیخارە دەکات و، دڵی هێشتا ئارام نابێت لەوەی شوو بەو گەنجە بکات، زۆربەی کچان جوانی و قۆزی کوڕانیان دەوێت، ئەگەر کوڕی جوانی دیت لای هاوڕێکانی خۆزگە دەخوازێ مێردی پێ کردبا، بەڵام گەنجی هەژار و دیندار بێ جوانییەکەی مامناوەند بێ، لەترسان هانا بۆ سوننەتی ئیستیخارە دەبات و، دڵی هەر نائارام دەبێت، چونکە قۆز و کەشخە نیە، گەرنا چاکی و باشیی گەنجە دینداره ڕاستگۆکان دیارە و ڕوون بووەتەوە، بە چ بیانوویەک دوودڵ دەبیت تەنیا حەز و ئارەزووی دونیایی زاڵە بەسەرت، جوانی و دەوڵەمەندیی گەنجەکەیە وا دەکات دڵەڕاوکێ بی.

بۆیە خوشکی دیندارم، ئەی ئەو خوشکەی کە دەتەوێت ژیانێکی بەختەوەر بەسەر ببەی لە دونیادا، هەر کات گەنجێکی دیندار و ئەهلی تەوحید هاتە داوات بەهێز بە و بەسەر دڵتدا سەرکەوە و خۆت دوودڵ و ڕاڕا مەکە، ئەمە هەموو وەسوەسەی شەیتانە زاڵ دەبێت بەسەر دڵتدا، کە شوو نەکەیت و دوودڵ و قەلەق بیت، بەبێپیاوی بمێنیتەوە و تووشی تاوان و بێفەرمانی خودای گەورە بیت و بە شێوەیەک نەتوانی بڕیاری شووکردن بدەیت.

پاشان ئەو گەنجەی هاتووەتە داوات شاهێدی بۆ دەدرێت لەنێو ئیمانداران کە کوڕێکی بۆ خودا سوڵحاوە، تۆ بە چ بیانوویەک ڕەتی دەکەیتەوە، ئەگەر

کوڕەکە شەلاتی و دوور لە دین و کەسی پشت کۆڵان و دیوارەکانیش با کێشە نەبوو، ڕەتت کردباوە، بەڵام گەنجانێکی پاکی هەمیشە دەستبەدەستنوێژ و موحید زووڵمە لە خۆتی دەکەیت، کە خۆت قەلەق دەکەی، یان بەتەمای تەواوی ژیانت بە قەیرەیی و خەم و خەفەتەوە بەسەر ببەیت!
بزانە دایکی و باوکی زۆربەمان کەسیان سوننەتی ئیستیخارەی نەکردەوە و ئێستاش ژیانی زۆربەیان بێکێشەیە و، چەندان نەوەیان هەیە. بۆیە کە گەنجەکەت بەدڵ نەبوو جوانی و کەشخیی گەنجی تری جوانترت دەویست، بەقەست مەچۆ سوننەتی ئیستیخارە بکەیت، چونکە هەر ناکەوێتە دڵت و هەر لە بەر دڵت ڕەقە، بۆیە هەر گەنجەکە ڕەت بکەوە و، بڵێ کاتی شووکردنم نەهاتووە، یان بیانووی تر بدۆزەرەوە، نەک سوننەتی ئیستیخارە بکەیتە بیانوو، ئەو کاتی دەیان جار ئەم سوننەتە بکەی، هەر دوودڵ دەبی و ئاسودە نابیت، چونکە هەر لە سەرەتاوە بەدڵت نەبووە، ئێمە ناڵێین واز لەم سوننەتە بێنن، خاڵێکی تری گرنگیش کەوا زۆربەی موسڵمانان و کچان لێی بێئاگان: ئەویش ئەوەیە، کە ئەنجامدانی نوێژی ئیستیخارە بۆ ئەوە نییە، تاوەکوو بڵێی دوودڵیم نەمێنێت! بەڵکوو دوای ئەنجامدانی ئەم نوێژە و پرسوڕا دەچیت بەدەم کارەکەتەوە، ئەگەر خێری تێدا بێت ئەوا خودای گەورە ئاسانی دەکات، گەر خێریشی تێدا نەبێت، خودای گەورە لە شەڕ و فیتنەکەی لات دەدات و دەتپارێزێت. پاشان تۆ ئەوەندە خۆت پێ ئیمانداره تەنیا بۆ شووکردن سوننەتی ئیستیخارە مەکە، بۆچی ئەم سوننەتەت بەستووەتەوە بە هاوسەرگیری، ئەگەر ڕاستگۆی لەسەر سوننەتی، بۆ هەموو کارەکانت بیکە، بۆ ئەنجامدانی سەفەرکردن، بۆ کڕینی کاڵاو و شتومەکیش، بۆچی تەنیا

پێوەستتان کردووە بە هاوسەرگیری و دواتر کە چوونە ژیانی هاوسەریش دەیان کار ئەنجام دەدەن بەبێ کردنی ئیستیخارە و، واز لەم سوننەتە دەهێنن، لە کاتێکدا دەزانن کوڕە دیندار و موتتەقییە، حەقیقەت و ڕاستیت بۆ دەرکەوتووە کە گەنجی چاک و عەقیدە پاکە، بۆیە ئەگەر بەختەوەریت دەوێت دوودڵ مەبە و ڕازی بە.

بۆیە زۆرێک لە کچان بە بیانووی ئەوەی دوودڵن و ڕاڕانە پەلە دەکەن و، کوڕە ڕەت دەکەنەوە بەبێ ئەوەی لێی بکۆڵنەوە، کە کوڕێکی دیندار و تەقوادارە، ژیان لەگەڵیدا بەختەوەر بوونە، بەداخەوە زۆربەی جار باوک و برا و ماڵەوەی کچەکە ڕازینە و هیچ ڕێگر نین لەو کوڕە دیندارە ببێتە زاوایان، بەڵام کچەکە گەنجەی بە دڵ نیە، بەهۆی جوانی بێ یان هەژاری، یەکسەر بە ماڵەوە بڵێ ڕازی نیم و تەواو، من ئەو کوڕەم ناوێت، نەک کە بەدڵت نییە دەچی بە قەست و بەپەلە سوننەتی ئیستیخارە دەکەی و دەڵێی بەو کوڕە بڵێن سوننەتی ئیستیخارەی کردووە و هەر ڕاڕایە و دوودڵە، بۆیە قسمەت نابێ!

ئەمە خۆهەڵخەڵەتاندنە سیفەتی موسڵمان نییە و بە داخەوە کچە بەس بەتەمای ئەوەیە جوانترین و کەشخەترین کوڕ ببێتە پیاوی، بۆیە بەم شێوەیە کوڕەکە ڕەت دەکاتەوە و خۆی دەهێڵێتەوە، کە بەم شێوەیەیش بووی دەبێ لەسەر هەموو دڵتەنگی و خەم و ئازار و قسەکانی دەوروبەرت ئارام بگریت، کە قسەی ناخۆش و ڕوخێنەرت پێ دەگوترێ، بۆچی ماویتەوە، بۆچی شووت نەکردووە وا پیر بووی، وا سەرت سپی بوو، بۆیە کە تۆ خۆت دوودڵ و ڕاڕا دەکەی لە گەنجی ئیماندار لە کۆتاییدا بەرگەی خەم و میحەنەتەکانیشت بگرە کە ڕوو بەڕووت دەبێتەوە.

# مەرجی کچی ژیر چیە بۆ هاوسەرگیری

کچە ئیماندار و موحیدەکان لە ڕاستی ژیان تێگەیشتوونە، هیچ شتێک بەلایانەوە گرنگ نییە لە ماڵی دونیایی، نە پارە و سەروەت و سامان نە جوانی کوڕەکان، تەنیا و تەنیا خەمی دینی پیاوەکانیانە، کە دەبن بە هاوسەریان، چونکە دەزانن هەر پیاوێک دیندار و موحید بوو، کەسێکی ئاقڵ و ژیرە، لە داهاتوودا لەگەڵ خێزانەکانیان ژیانێکی بەختەوەر و پڕ لە خۆشەویستی و یادگاری لەپێناو خودا بەڕێ دەکەن، بۆیە ئەو خوشکانەی کە خۆیان پێ دیندارە لەم سەردەمەی پڕ فیتنە و ئیماندۆڕاندنەدا کە خەڵکی بەگشتی بۆ دونیا و خۆشییەکانی دەژین، دەبێت خەمی هیچیان نەبێت وەکوو گوتمان تەنیا پیاوێکی دینداری موحیدی ڕاستەقینە بێت، کەسێک بێت بەڕاستی بەندەیەکی دڵسۆزی خودا بێت و، دڵەکەی نوقمی دەریای ئیمان و تەوحید بووبێت، زەرەری بۆ گیاندار و بچووکترین شت نەبێت، ئەم جۆرە گەنجانە نموونەی تابعین و پێشینە چاکەکانن، شایستەی ئەوەن هەموو قوربانییەکیان بۆ بدرێت.

ئیسلام هانی ئەوەی داوە گرنگیشی پێ دەدات، کە ئەو کەسەی هاوسەر هەڵدەبژێرێ خاوەن ڕەوشت و دین و داوێنپاک و خاوەن ئیمانێکی پتەو بێ و ملکەچی یاساکانی قورئان بێ، بۆیە هەر کچێک مارەیی دەستە جلێک بێ، یان شتێکی زۆر کەمتریش بێ شایەنی ئەو گەنجە تەقوادار و بۆ خودا سوڵحاوەیە، بۆیە دەبێ خوشکان لێ بزانن چ جۆرە گەنجێک هەڵدەبژێرن، ئایا گەنجی

ڕاستەقینەی ئەهلی تەوحید، یان گەنجی دونیاپەرست و دواکەوتووی مۆدێلەکان، ئەمە چەند نموونەیەکن لەو ئافرەتە ساڵیحانەی کە چۆن تەنیا ئیسلام و ڕەوشتیان کردووەتە مەرجی شووکردنیان و خۆبەختکردنیان لەپێناو ئیمان و ئیسلامدا.

هاوەڵی ئازیز "ئەنەسی کوڕی مالیک" (ڕەزای خودای لێ بێت) دەگێڕێتەوە و، دەفەرمووێت: ""ابو طلحة" (زيد بن سهل الأنصاري) (ڕەزای خودای گەورەی لێ بێت) چووە داوای ئوم سولەیم، (ڕەزای خودای گەورەی لێ بێت) پێش ئەوەی "ابو طلحە" موسڵمان ببێت، داوای هاوسەرگیری لە ئوم سولەیم کرد، ئەویش پێی فەرموو: گەر من بڵێی، ئەوە من خۆم لاریم نییە لە هاوسەرگیریکردن لەگەڵت و، هاوشێوەی تۆ ناگێڕدرێتەوە و ڕەت ناکرێتەوە، بەڵام تۆ پیاوێکی کافریت و منیش ئافرەتێکی موسڵمانم، ئەگەر موسڵمان بیت، ئەوا موسڵمانبوونت با مارەییەکەم بێت، داوای هیچی ترت لێ ناکەم و هیچم ناوێت-گەر موسڵمان بیت شووت پێ دەکەم- ئەوە بوو "ابو طلحة" موسڵمان بوو و، هاوسەرگیریشی لەگەڵ ئوم سولەیم کرد.[١]"

ئافرەتانی موسڵمانی ژیر دەبێت نموونەی وەک ئوم سولەیم بن، نەک ساویلکە و دونیاویستی چاویان ببەستێت، دەبێ زۆرزان و بەحیکمەت بن؛ بۆیە دەتوانێ ئەو گەنجەی دێتە داوای پێی بڵێت، ئەگەر خۆت بفرۆشی بە خودا و خۆت ڕادەستی بەرنامەی خودا بکەی و، بۆ ڕەزامەندیی خودا لەگەڵم بژییت، من مەرج و مارەیی و ماڵی زۆرم ناوێت، بەڵام بە داخەوە ئەمڕۆ ئەوەی باس نەکرێت و گرنگی پێ نەدرێت، تەنیا ئیسلام و ئیمانی زاوایە.

---

[١] - بروانە: مصنف عَبدُ الرَزَّاق (رحمه الله)، ج. ٥.

الأصمعي، دەڵێ: حەسەن فەرمووی: كاتێ لە سەردەمی نەزانی و جاهیلیدا پیاوێک داوای ئافرەتێكی بكردایە و هاوسەرگیرییان بكردایە دەربارەی قەدر و ڕێز و نەسەب و شجاعەتی ئەو خێزانە لەنێو خەڵكدا پرسیاریان لە یەک دەكرد، بەڵام كاتێک ئیسلام هات پیاو و ئافرەت تەنیا پرسیاریان لە دین و ڕەوشت و بیروباوەڕی یەكتر دەكرد، كە عەقیدەی پاک بایە ئەهلی ئیمانە و یەكخواپەرست بایە تەواو هەر ئەوەندە.[1]

بەڵام ئەمڕۆ ئێوە دەربارەی ماڵ، سامان، ناوبانگ، عەشیرەت، ماڵی دونیا و مەبەستە دونیاییەكان پرسیار لە یەكتری دەكەن؛ بۆیە ژیانی زۆربەی خێزانی ئێستا سەركەوتوو نابێ و بەختەوەر نابن كە خوشكانێک ناویان لە خۆیان ناوە موحید و ئیماندار كەچی دوودڵ و قەلەقن لە گەنجی ئیمانداری ڕاستگۆی سالح و چاكەكار، خوشكە بەڕێزەكەم كە كەسێكی ئیماندار هاتووەتە خوازبێنیت، دەزانی ئیمانداره و عەقیدە و باوەڕەكەی تەواوە، شووی پێ بكە؛ ئەوەندە خۆت قەلەق مەكە و بێخەم بە لەوەی لەگەڵت خراپ نابێت، ئافرەتانی پێشین ئەوەندە سوور بوون لەسەر ئەوەی كەسێكی چاكی لەخوداترس ببایە هاوسەریان لە ژیانی دونیا سپاسی خودای گەورەیان دەكرد.

ئەمەش نموونەیەكی ئافرەتانی ژیری سەردەمی پێغەمبەری ئازیزە ﴿ﷺ﴾ كە خۆیان داوایان لە پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ كردووە بەشوویان بدەن بە پیاوێكی شایستە و تەقوادار و دڵ پڕ لە ئیمان.

نموویەكی ئاوا جوان لە مێژووی هیچ ئاین و دینێک نەبینراوە كە سەركردەی وڵاتێک بەم شێوە جوانە هەڵوێست بنوێنێ بەرانبەر كەسی هەژار و نەدار.

---

[1] - بروانە: بَهْجَةُ المَجَالِس ١/١٨١.

ڕۆژێک ئافرەتێک هاتە لای پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾بۆ ئەوەی بەشووی بدات، لەو دەمەدا پیاوێک هەستایە سەرپێ و بە پێغەمبەری ئازیزی ﴿ﷺ﴾ گوت: ئەی پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾، لە منی مارە بکە.

پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: هیچت هەیە پێی بدەی وەکوو مارەیی؟

پیاوەکە گوتی: نەخێر، ئەی پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ هیچم نییە.

پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: بڕۆ بۆ ماڵەوەتان بۆ شتێ بگەڕێ و بیهێنە، پیاوەکەش چووە ماڵەوە و هاتەوە، گوتی: ئەی پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾، هیچم دەست نەکەوت!

پێغەمبەری ئازیز﴿ﷺ﴾، پێی فەرموو: ئەی ئەڵقەیەکی ئاسنت دەست نەکەوت؟!

پیاوەکەش گوتی: نەخێر، سوێند بە خودا، ئەی پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾.

بۆیە پیاوەکە تەنیا ئیزارێکی-جلی خوارەوە-ی لەبەردا بوو.

گوتی: ئەم ئیزارەی دەدەمێ وەکوو مارەیی!

پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ پێ فە رموو: ئیزارەکەت!

ئەگەر ئەو بیکاتە بەری ئەوا هیچی بۆ خۆت نامێنێ، ئەگەریش تۆ لەبەری بکەیت، ئەوا هیچی بۆ ئەو نامێنێ!

پیاوەکەش چووە لایەکەوە و دانیشت، دوای ماوەیەک پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ پیاوەکەی بینی ڕۆیشت بانگی کردەوە و، پێی فەرموو: چەند قورئانت لەبەرە؟

پیاوەکەش، گوتی: ئەو سورەتە و ئەو سورەتە و هەندێکی کەمی بۆ ژمارد کە لەبەری بوو.

پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ پێی فەرموو: بەو هێندە سورەتەی کە تۆ لەبەرت کردووە، من لێتی مارە دەکەم.

﴿حَدَّثَنَا سَهْلُ بْنُ سَعْدٍ ﴿ﷺ﴾: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ ﴿ﷺ﴾ جُلُوسًا، فَجَاءَتْهُ امْرَأَةٌ تَعْرِضُ نَفْسَهَا عَلَيْهِ، فَخَفَّضَ فِيهَا النَّظَرَ وَرَفَعَهُ، فَلَمْ يُرِدْهَا، فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِهِ: زَوِّجْنِيهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: أَعِنْدَک مِنْ شَيْءٍ ؟. قَالَ: مَا عِنْدِي مِنْ شَيْءٍ. قَالَ: وَلَا خَاتَمٌ مِنْ حَدِيدٍ. قَالَ: وَلَا خَاتَمٌ مِنْ حَدِيدٍ، وَلَكِنْ أَشُقُّ بُرْدَتِي هَذِهِ، فَأُعْطِيهَا النِّصْفَ، وَآخُذُ النِّصْفَ. قَالَ: لَا، هَلْ مَعَک مِنَ الْقُرْآنِ شَيْءٌ؟. قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: اذْهَبْ فَقَدْ زَوَّجْتُكَهَا بِمَا مَعَک مِنَ الْقُرْآنِ﴾[1].

دەی خوشکانم، ئێوە دەڵێن ئیماندارین و گوێڕایەڵی خودای گەورەین، پاشان پێغەمبەری ئازیزین ﴿ﷺ﴾، ئایا کەستان هەیە لەم سەردەمەدا ئەوەندەی ئەو ئافرەتە گوێڕایەڵی بکات بۆ فەرمانی پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾، کە بیدات بە پیاوێک هیچی نەبێت؟ بە داخەوە! زۆرێک لە خوشکان ساویلکە و خۆشباوەڕن کە زوو بە کەسی دونیاپەرست و دوور لە دینی ئیسلام هەڵدەخەڵەتێن، کە دەبینن ئەو کچانە پیاوە نەزان و دوور لە ئیسلام و ئیمان چۆن ئاهەنگی گەورە بۆ ژنەکانیان لە ڕۆژی مارەیی و گواستنەوەدا ڕێک دەخەن، ئەوانیش بڕیار دەدەن شوو بە کوڕی ئاوا بکەن، بۆیە ئەم عاتفییەیان بووەتە هۆی ئەوەی لە داهاتوودا ببەنە قوربانی حەزو ئارەزووی نەفسییان یان بە قەیرەیی بمێننەوە، یان پیاوێکی خراپی خاوەن ژن و منداڵ ببێتە هاوسەریان، بۆیە هیوادارین بیرێک لە ژیانی خۆیان و داهاتوویان بکەنەوە، قەلەق نەبن لە گەنجانێکی بۆ خودا سوڵحاو. کچی دیندار، ئەو کچەیە، تەنیا خەمی دینی پیاوەکەیەتی و

[1] - بروانە: سەحیحی بوخاری ژمارەی فەرمووده: ٥١٣٢.

دوودڵ نابێت لە بڕیاری شووپێکردن بەو گەنجە یەکخواپەرستە؛ مەبەستیشم لەوەی کە دەڵێم گەنجی موحید، واتە: گەنجێکی ڕاستگۆ لەگەڵ خودا-گیان و ئارەزووی نەفس و خۆشیی دونیایی فرۆشتووە بە خودای گەورە-، کە هەرچی لێ بێت لەسەر دینی خودا گوێی لێ نییە، و خۆی فرۆشتووە بە خودا، ئەمانە قابیلی هەموو شتێکن، کە خوشکان بەدەستیان بێنن، کە لە داهاتوودا لێی پەشیمان نەبیتەوە و، ڕێزت بگرێ و بە گرنگترین شتی دونیا نەتگۆڕێتەوە و لە دونیادا ژیانێکی بەختەوەر لەگەڵت بەسەر ببات، ئێمە ناڵێین ئەی خوشکم، هەر کات کوڕێک داوای کردی یەکسەر ڕازی بە، بەڵکوو لێکۆڵینەوە بکە بپرسە لە باوک و برا و دایکت کاتێک بۆت دەرکەوت، بەڵێ، عەقیدەی پاکە، موحیدە، یەکخواپەرستە و بۆ خودا سوڵحاوە ئەو کات ڕازی بە و دوودڵ مەبە و بڕیاری کۆتایی بدە؛ بڵێ ڕازیم.

ئەگەریش دەڵێت باوکم ڕازی نابێت بە کوڕی دیندار و، من ڕازیم، ئەوە خۆت بێدەنگ مەکە لە ماڵەوە، دەتوانی بەجوانی قسە لەگەڵ باوک و دایکت بکەیت شەرم مەکە و لەپێناو دوارۆژی خۆت بڵێ، من ڕازیم، لاریم نییە لە گەنجی ئیماندار، چونکە کوڕە دیندارە و خراپەی بۆم نابێت، من چی لە جوانی و کەشخەیی و دەوڵەمەندی بکەم کە بۆم باش نەبوو و ڕێزی نەگرتم، بەم شێوەیە دەتوانی قەناعەت بە ماڵەوە بکەیت و، شەرم مەکە لەپێناو بەختەوەریی خۆت دەبێ قوربانی بۆ کەسە باشەکان بدەیت، تاوەکوو بەدەستیان بێنیت.

چەندان خوشکی ئیمانبەرزی پۆڵاین هەبوون باسوخواسیانم بیستووە لەپێناو گەنجی ئیمانداری ڕاستەقینە هەموو قوربانییەکیان داوە، ماڵەوەیان

ڕازی نەبوونە کچیان شوو بەو گەنجە بکات، بەڵام کچەکە هەر پێداگر بووە و ڕازی بووە و وازی نەهێناوە لە ماڵەوەی کە دەبێ هەر بەو گەنجە ڕازی بن و هەر ئەو گەنجەی دەوێت بۆ هاوسەرێتی، بەم شێوەیە وازی نەهێناوە بۆیە ماڵەوەی بەو مەرجە ڕازی بوونە کچیان شوو بەو کوڕە بکات، یەکجاری بێت و نەهێتەوە بۆ ماڵەوەیان و حاشای لێ دەکەن جارێکی تر بێتەوە، بەڵام ئەو کچە هەر ڕازی بووە بەو گەنجە و هەموو قوربانییەکی داوە بۆ بەدەست هێنانی.

بەڵێ، بەم شێوەیە چەندان نموونە هەن، کچی ئیمانداری ئاقڵ لەپێناو گەنجی ديندار و یەکخواپەرست قوربانیی داوە، ڕووبەڕووی ماڵەوەی خۆی بووەتەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەو گەنجە ئیمانداره ژیانێکی بەختەوەر پێک بهێنن و لەگەڵیدا بژیت.

کوڕ و کچی ئیماندار ئاسانکاری بۆ یەکتر دەکەن لە هاوسەرگیری، بۆ ئەوەی بە یەکتر بگەن و ژیانی دونیا بە یەکەوە بەڕێ بکەن، برایەکی ئیماندار ڕۆیشتبوو بۆ داوای کچێک، کە لە ڕووی ماددەییەوە زۆر دەوڵەمەند نەبوو، ئەو کچە زۆر تەقودار و خاوەن دڵێکی پڕ ئیمان بوو، زانی و بۆی دەرکەوتبوو ئەم گەنجە هەژارە و بەڵام دیندارە و یەکخواپەرستە، بۆیە پێی گوتبوو خەمی هیچ تێچوو و زێڕ و ماڵت نەبێ، هیچم ناوێت تەنیا لەپێناو خودای گەورە پاشان ئیمانەکەت و عەقیدەکەت، هیچ زێڕم بۆ مەکڕە، تەنیا ئەگەر ماڵەوە گوتیان دەبێ لەسەر ئەوەندە مسقاڵە بێ ئەگەر لەسەر ئەوەندە نەبێ، نابێ شووی پێ بکەی، ئەو کاتە تۆ ڕازی بە بەو مەرجەیان، بەڵام تۆ هیچ زێڕ مەکڕە من بە هاوڕێ کچەکانم دەڵێم زێڕەکانی خۆیان بە من بدەن بە ئەمانەت دواتر بە دزی دەیگەینینە دەستی تۆ، ئەو کاتە لای ماڵەوەمان بڵێ من زێڕم هەیە،

پاشان کە بۆ ڕۆژی بووکێنی زێڕەکانم بەکار هێنا بۆ هاوڕێکانم دەگەڕێنمەوە و، لای ماڵەوەش ئەگەر باسی زێڕیان کرد، دەڵێم پیاوەکەم فرۆشتوویەتی بۆ مە سروفاتی ماڵ، سبحان الله بەڕاستی ئەمە نموونەی کچی ژیر و ئاقڵی خاوەن ئیمانە، ئەوجا ئێستا خاوەنی منداڵن و ژیانیان زۆر بێکێشە و تەبایە، کوڕی ئاقڵ و دیندار دەبێ خەمی ئەوەی بێ کچی دیندار بخوازێ و، لەماڵی باوکی جاهیل و نەزان دەری بێنێ، چونکە زۆربەی کچە دیندارەکان لەلایەن باوک و دایک و کەسە نزیکەکانی ڕێگریی لێ دەکرێت بەوەی بە شێوەی شەرعی خۆی بپۆشێ و عەبا و نیقاب بکات، دەچەوسێندرێتەوە، ئەو کچەش دەبێ هەموو قوربانی و ئاسانکارییەک بکات لەپێناو ئەو کوڕە ئیمانداره و داوای زێڕ و مە سروفات و ماڵی زۆری لێ نەکات، لەپێناو خودای گەورە و پاشان بە یەکەوە ئازاد و سەربەستانە دینداری و عیبادەتی خودای گەورە بکەن و ژیانی دونیا بەخۆشەویستی، تەبا، ڕێز و ڕاستگۆیی و وەفا بەسەر ببەن.

ئینجا ئێمە پێمان گەیاندن و خودا دەکەینە شاهێد، لە خەمخۆریی خۆمان بوو بۆ ئێوەی ئیماندار؛ پێمان گوتن، ئێوەمان ئاگادار کردەوە ئیتر ئۆباڵی ناخۆشی، ئازار و دەردەسەریی دواڕۆژی خۆتان بە قەیرەبوون یان بە پیاوی جاهیل و دونیاپەرست بە ملی خۆتان.

# خۆشبەختیی هاوسەرگیری لە چیدایە؟

لە ژیانی دونیا بۆ ئەوەی بە ژیانێکی خۆش بژییت لەپاش ئیمان و ئیسلام تەنیا پێویستت بە ئەقڵ و حیکمەت و لێزانینە، ئەگەر ئەقڵ و ژیری نەبوو، جوانی، باڵابەرزی، هێز، کەشخەیی و دەوڵەمەندی هیچ سوودێکی بۆ مرۆڤ نابێت، کە تۆ کەسێکی جوان و باڵابەرز بوویت، بەڵام نەتزانی چۆن هەڵسوکەوت بکەیت لەگەڵ بەرانبەر، جوانییەکەت نابێتە هۆی دڵخۆشکردنی خەڵکی، ئەگەر ڕێز و سۆزت بۆیان نەبوو.

بۆیە چەندان کچ بە هۆی هەڵبژاردنی گەنجی دەوڵەمەند یان جوان و قۆزی یان خاوەن بڕوانامە و کەسی ناودار بوونە قوربانیی حەز و ئارەزووەکانیان و ژیانیان فەوتا و ئاوات بە مردن دەخوازن، لەدەست خراپی هەڵسوکەوتی پیاوەکانیان، کە نازانن سۆز، خۆشەویستی، ڕێز و ناز بە خێزانەکانیان بدەن، بۆیە لە چەندان ئافرەتی تەڵاقدراومان بیستووە، کە بۆ جیا بووەتەوە، گوتویەتی: "من پیاوێکم بۆ چییە! کە نەتوانێ گوێ لە خەم و دڵتەنگیم بگرێت، کە ئیهمال، بێهەست و سۆز بێت لەگەڵم، کە زاڵم، دڵڕەق و بێڕەحم بێت"، بۆیە تەنیا ئەو ئافرەتانە قەدری پیاوی باشیان لایە و خۆزگەی بۆ دەخوازن کە باش و بەڕێز بن و، بە بەراورد بەوانەی بەدەست پیاوی خراپ و بێهەستەکانیان دەناڵێنن، بۆیە ڕەحمەتتان لێ بێت ئەو (کوڕ/ کچ)انەی کە دەتانەوێت هاوسەرگیری بکەن، بەدوای جوانی، کەشخەیی و دەوڵەمەندی مە

کەون، شتانێک خۆشبەختی بە ژیان بدەن (ئیمان، ئیسلام، کەسی دیندار و لە خوداترس)ن.

لە سوننەتی پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾بۆ هاوسەرگیری تەنیا باسی چوار خاڵی کردووە، هەروەکوو لەم فەرموودەیەدا ئاماژەی پێ دراوە:

**﴿ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﴿رضي الله عنه﴾ عَنِ النَّبِيِّ ﴿ﷺ﴾قَالَ: تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لِأَرْبَعٍ: لِمَالِهَا وَلِحَسَبِهَا وَلِجَمَالِهَا وَلِدِينِهَا، فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ﴾**[1]. واتە: ابو هريرة (خودای گەورە لێی ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: لەبەر چوار مەبەست ئافرەت دەخوازرێت: یان بۆ ماڵ و سامانەکەی، یان لەبەر بنەماڵەکەی، یان لەبەر جوانییەکەی، یان لەبەر دینداریيەکەی، جا تۆ ئافرەتی دیندار بهێنە، تا دەست پڕ بەرەکەت بیت.

لێرەدا تەنیا ئاماژەی بە چوار خاڵ کردووە، یان دەوڵەمەندی و پارە و سامان، یان لەبەر بنەماڵەکەی، یان جوانییەکەی، یان دینداری و یەکخواپەرستی، لەم چوار خاڵەدا تەنیا یەک خاڵی بەسەر هەموویاندا هەڵبژاردووە، ئەویش دینداری و یەکخواپەرستییە.

بۆیە گرنگترین شت لە دونیادا ئیمان و ئەخلاق و ڕەوشتن، ئیمان و ئیسلام وا لە ژیان دەکەن، کە خۆشی و ئاسوودەیی ببینی لە دونیایەکی کاتی و کەمدا.

هەڵبەت ئەو کەسەی خاوەن ئیمانە ژیر و تێگەیشتووە، ئیسلام وا لەو کەسە دەکات ئاقڵ و ژیر بێت و تێگەیشتنی پێ دەبەخشێ بۆ شتەکان، هەست بە هەموو شت دەکات، دەزانێ کاتێک تۆ بێتاقەتی یان، دڵتەنگی؛

[1] - بروانە: سەحیحی بوخاری ژمارەی فەرموودە: ٤٨٠٢

بۆیە لێت تێ دەگات، هەوڵ دەدات خەم و ئازارەکانت نەهێڵێ، ئەگەر گیانی بەخشیبێت لەپێناو دڵخۆشبوونت.

ابن أبي الدنيا لە کتێبی (النفقة على العيال)دا بە سەنەدی خۆی لە (سلمه کوڕی سەعید)ەوە دەگێڕێتەوە، گوتی: پیاوێک بە "حەسەنی بەصرِی"، گوت: ﴿إِنَّ عِنْدِي ابْنَةً لِي وَقَدْ خُطِبَتْ إِلَيَّ فَمَنْ أُزَوِّجُهَا؟﴾، واتە: کچێکم هەیە، خەڵکی خوازبێنی دەکەن لێم، لە کێی مارە ببڕم؟

فەرمووی: ﴿زَوِّجْهَا مَنْ يَخَافُ اللَّهَ فَإِنْ أَحَبَّهَا أَكْرَمَهَا وَإِنْ أَبْغَضَهَا لَمْ يَظْلِمْهَا﴾، واتە: لە کەسێکی مارە ببڕە، کە لە خوداترس بێت، چونکە ئەگەر خۆشی ویست ڕێزی دەگرێ، ئەگەریش خۆشی نەویست و ڕقی لێی بوو ستەمی لێ ناکات.

لەبەر ئەوە کەسی لەخوداترسیی موتتەقی هەڵبژێرە؛ ئەوان ڕاستگۆن و لە خودا دەترسێن ئازاری مێرووله بدەن، بۆیە ئەگەر خۆشی نەویستی لە ژیان ئەوە زووڵمت لێ ناکات و خراپ نابێت، هەوڵ دەدات بە هەر جۆرێک بێت لەگەڵت بژییت، بەکورتییەکەی تەنیا موتتەقی شایەنی هەموو شتێکن، بەڵام موتتەقیی ڕاستەقینە، نەک تەنیا بە ناو، دەبێ دڵنیا بی کە تەقوادار و یەکخواپەرستە.

بەڵێ، تەنیا کەسی باش و دینداری ڕاستەقینە قەدری کەسە باشەکان دەزانێت و هەموو هەوڵێک دەدات بۆ ئەوەی لە ژیان بەدەستی بێنێت، چونکە دەزانێ ژیان بەسەربردن تەنیا لەگەڵ تەقوادار بەختەوەری و خۆشی بە ژیان دەبەخشێت، هەوڵ دەدەن بە یەکەوە ژیانێکی پڕ لە خۆشەویستی، ڕێز، وەفا و یادگاری لەگەڵ یەکتر بەسەر ببەن، خراپە و خیانەت لە یەکتر ناکەن،

چونكە ژیر و تێگەیشتوونە، پیاوەكە دەزانێ ماندوبوونی زۆری بینیوە لە هێنانی ژنەكەی، نایەوێت خراپە و خیانەت بكات، لەبەر ئەوە بۆ ژنی خۆی دەژیت و هەموو گرنگییەكی پێ دەدات و، ژنەكەشی زووڵم و خیانەت ناكات، دەزانێ پیاوێكی وەفادار و ڕاستگۆ و ئەخلاقبەرزی هەیە بە دونیای ناگۆڕێتەوە، بەم شێوەیە ژیانێكی بەختەوەر بەڕێ دەكەن.

بەڵام ئەگەر هاتوو بۆ بێجگە لە دین و ئیمان، جوانی، قۆزی، دەوڵەمەندی و، قەومایەتی یان مەبەستی تری دونیایی هاوسەرگیری كرا، ئەو كات سەركەوتوو نابێت، چونكە جوانی كاتییە و بە تێپەڕبوونی كات جوانیش نامێنێ؛ بۆ دەوڵەمەندییش نەبوونی و هەژاری بەسەر دێ، هەرچی مەرجی دونیاییە گشتی كاتین و بەسەر دەچن بە شێوەی ئیمان و تەقوا خۆشبەختی بە ژیان نادەن، ئیمان و تەقوا وا لە مرۆڤ دەكەن، كە چۆن بەسەر بەربەستەكانی دونیا و ناخۆشییەكانی سەركەوتوو بێت.

ئەمە نموونەیەكە لەو كچە تەقوادار و دڵ پڕ لە ئیمانەی گوێڕایەڵی وەسیەت و ئامۆژگاریی پێغەمبەری ئازیز﴿ﷺ﴾، دەبێت، كە تەنیا ئیمان و تەقوادار هەڵدەبژێرن، هیوادارم ئەم بەسەرهاتە ببێتە ئامۆژگاری و هاندانێك بۆ ئەو خوشكە بەڕێزانەی كەوا بەدوای جوانی و ناوبانگی كوڕەكانەوەن، ببنە نموونەی ئەو ئافرەتە سەركردەیەی كە شووی كرد بە كەسێكی ناشیرین لەبەر چاوی خەڵكی.

پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ هاوەڵێكی هەبوو، پێسترەش بوو، لەگەڵ ئەوەشدا شتێكی وای نەبوو لە ماڵ و سامان و هەژار بوو، ئەم هاوەڵە ناوی جولەیبیب بوو (ڕەزای خودای گەورەی لێ بێت) ڕۆژێك پێغەمبەری ئازیزمان ﴿ﷺ﴾

پێشنیازی كرد و فەرمووی: 'ئەی جولەیبیب، دەبێ ژن بهێنی'، ئەویش گوتی: 'ئەی پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ كێ هەیە شوو بە من بكات، منی ناشیرین، نامۆ و هەژار!'

پێغەمبەری خۆشەویست﴿ﷺ﴾، پێی فەرموو: 'ئەی جولەیبیب، لای خودای گەورە تۆ جوانی.'

پێغەمبەری خاوەن سۆز و وەفا ﴿ﷺ﴾ بەدوای هەلێكدا دەگەڕا بۆ ئەوەی كە سێكی شیاوی بۆ بدۆزێتە، تاوەكوو ڕۆژێكیان پیاوێک سەردانی پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾دەكات، دەڵێ: 'ئەی پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾، من كچێكم هەیە تا ئێستا پیاوی نییە و، بێوەژنە؛ ئەگەر حەز دەكەی ئەوا پێشكەشتی دەكەم—بە واتای ئەوەی تۆ بیخوازە.'

پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ یەكسەر پێی فەرموو: 'بەڵێ، دەمەوێت'، باوكیشی زۆر دڵخۆش بوو، گوتی: 'بەڵێ، باشە ئەی پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾'

پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: 'بەڵام من بۆ خۆم نامەوێ، بەڵكوو بۆ جولەیبیب دەمەوێ. '

باوكەكەش گوتی: 'جولەیبیب، ئەی پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾؟!'

پیاوەكە گوتی: 'پەلەم لێ مەكە، تاوەكوو پرسیارێک لە دایكی دەكەم، بزانم چی دەڵێت!'

كاتێک پیاوەكە گەڕایەوە ماڵەوە و بە خێزانەكەی گوت: 'پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ داوای كچەكەمانی كردووە'، ژنەكەش زۆر پێی خۆش بوو.

بەڵام پیاوەكە، پێی گوت: 'ئافرەت، بەڵام بۆ خۆی نایەوێ.'

ژنەكەش، پێی گوت: 'ئەی بۆ كێی دەوێ؟!'

پیاوەکەش، گوتی: 'بۆ جولەیبیب!'
ژنەکەش گوتی: 'ناشیرین و بێفەڕ لە جولەیبیب؛ نەخێر، سوێند بە خودای گەورە من ئەو کچە بە جولەیبیب نادەم، لە کاتێکدا ئێمە کەسانێکی جوانی وەکوو ( فلان و فلان و فیسار) هاتنە خوازبێنی کچەکەمان، بەڵام ڕازی نەبوین ئێستا چۆن بە جولەیبیبی بدەین!'
(هەروەکوو ئەم دابوونەریتە جاهیلی و خواروخێچانەی ئێستاکە هەن لە کۆمەڵگەکەماندا، کاتێک دایک و باوک دەنگوباسی ئەو گەنجە دیندارەی داوای کچیانی کردووە، دەیان ناو و ناوتۆرەی لێ دەنێن)، پاشان پیاوەکە زۆر بێتاقەت بوو بەو قسەیە و هەستا بەشەرمەوە بۆ ئەوەی بچێتە خزمەتی پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ لەو کاتەدا کە کچەکە لە ماڵەوە بەوەی زانی، هاواری کرد و بە باوک و دایکی گوت: کێ داوای منی کردووە؟
ئەوانیش گوتیان: پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ بەڵام بۆ کەسێکی تر.
کچەکەش ئەوەندە ئیمانی بەهێز بوو، گوتی: ئایا ئێوە فەرمانی پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ ڕەت دەکەنەوە؟!
ئێوە من بنێرن بۆ لای پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾، ئەو، من بەزایە نادات و من نافەوتێنێت، دواتر باوکی کچکە چووە خزمەتی پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾، گوتی: ئەی پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾، خۆت باشتری لێ دەزانی، فەرموو بیدە بە جولەیبیب.
لەو کاتەدا پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ ئەو کچەی لە جولەیبیب مارە کرد و دواتر دوعای بۆ کردن و، فەرمووی: ئەی خودایە، خێر برژێنە بەسەریاندا، ئەی خودایە، ژیانیان ناخۆش مەکە.

پاش چەند ڕۆژێک جولەیبیب چوو بۆ جیهاد و تێکۆشان لەپێناو خودادا لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ و هاوەڵانی بەڕێزدا. بەڵام کاتێک شەڕ کۆتایی پێ هات، هاوەڵان (ڕەزای خودای گەورەیان لێ بێت) دەگەڕان بۆ ئەوەی بزانن کێ ماوە و کێ بریندارە و کێ شەهید بووە.

پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: ﴿هلْ تَفْقِدُونَ من أَحَدٍ﴾ واتە: بە هاوەڵانی فەرموو: ئایا کەستان بزر کردووە؟

﴿قالوا: نَعَمْ، فُلَانًا، وَفُلَانًا، وَفُلَانًا﴾ هاوەڵان گوتیان: فلان و فلان و فلانمان بزر کردووە!

﴿ ثُمَّ قالَ: هلْ تَفْقِدُونَ مِن أَحَدٍ؟﴾ دووبارە پێغەمبەری خودا﴿ﷺ﴾، فەرمووی: ئایا کەستان بزر کردووە؟

﴿قالوا: نَعَمْ، فُلَانًا، وَفُلَانًا، وَفُلَانًا﴾ هاوەڵان گوتیان: فلان و فلان و فلانمان بزر کردووە.

سێ جار پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ ئەم پرسیارەی لە هاوەڵان کرد، ئەوانیش هەمان وەڵامیان دەدایەوە.

پاشان پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾، فەرمووی: ﴿قالوا: لَا، قالَ: لَكِنِّي أَفْقِدُ جُلَيْبِيبًا، فَاطْلُبُوهُ فَطُلِبَ في القَتْلَى، فَوَجَدُوهُ إلى جَنْبِ سَبْعَةٍ قدْ قَتَلَهُمْ، ثُمَّ قَتَلُوهُ، فأتَى النبيُّ ﴿ﷺ﴾ فَوَقَفَ عليه، فَقالَ: قَتَلَ سَبْعَةً، ثُمَّ قَتَلُوهُ هذا مِنِّي وَأَنَا منه، هذا مِنِّي وَأَنَا منه قالَ: فَوَضَعَهُ علَى سَاعِدَيْهِ ليسَ له إلَّا سَاعِدَا النبيِّ ﴿ﷺ﴾، قالَ: فَحُفِرَ له وَوُضِعَ في قَبْرِهِ﴾[1].

---

[1] - بڕوانە: سەحیحی مسلم، ژمارەی فەرموودە (٢٤٧٢).

واتە: فەرمووی: من جولەیبیبم بزر کردووە، بۆیە هاوەڵان هەستان و بە شوێنیدا گەڕان، بەڵام لە گۆڕەپانی جەنگدا نەیانبینییەوە، لە جێگەیەکی نزیک بە کوژراوی بینییانەوە کە لەتەنیشت حەوت بێباوەڕەوە بوو و، هەمووشیان کوژرابوون.

"جولەیبیب" هەر حەوتیانی کوشتبوو، تاوەکوو خۆی شەهید کرا.

پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ لەسەر لاشەکەی وەستا و، فەرمووی: حەوت کەسی کوشتووە و پاشان شەهید کراوە.

دواتر فەرمووی: ئەمە لە منە، منیش لەوم؛ ئەمە لەمنە و منیش لەوم، دوو تا سێ جار ئەم قسەیەی فەرموو.

پاشان پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ بە دەستی خۆی هەڵیگرت و، فەرمانی کرد کە گۆڕێکی بۆ هەڵبکەنن.

هاوەڵی ئازیز ئەنەس (ڕەزای خودای گەورەی لێ بێت) دەگێڕێتەوە، دەفەرمووێ: ئێمە لەو کاتەدا خەریکی گۆڕهەڵکەندن بووین، جولەیبیب، هیچ جێگەیەکی تری نەبوو تەنیا دەستەکانی پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ نەبێت.

واتە: لەباوەشی پێغەمبەری خودا﴿ﷺ﴾دا بوو، تاوەکوو گۆڕەکەی بۆ کرا و خرایە نێو گۆڕکەیەوە (ڕەزای خودای گەورەی لێ بێت).

بە داخەوە دەڵێم: لەم سەردەمەدا زۆرێک لە خوشکان زۆر گرنگی دەدەن بەجوانی و ماڵ و، گرنگی نادەن بە گەنجێکی موحیدی هەژاری خاوەنی دین و ئیمان و ئەخلاقی بەرز، زۆر جار لەسەر لۆمەی کەسوکار و خزم و هاوڕێ داواکاری گەنجێکی خاوەنئیمان کە دێتە خوازبێنیان ڕەت دەکەنەوە، لەبەر ئەوەی کە وا جوان نییە یان هەژارە و پارەی نییە!

ڕەحمەتت لێ بێت، بۆ بەختەوەربوونت نە بەدوای جوانی بگەڕێ نە سەروەت، سامان، ناوبانگ و شەهادەی بەرز، چونکە ئەگەر کچ و کوڕی سەحابە و تابعینیش بێت ئەگەر خاوەن دین و ئەخلاق نەبێت، ئەوە جوانی و دەوڵەمەندی و شەهادە و ماڵی دونیایی هیچ سودێکی پێ ناگەیەنێت.

خوشکانی من بزانن، لەپێناو ئەوەی ژیانێکی خۆشت هەبێت کەسانی خاوەن دین و ئەخلاق و عەقیدە چاک ڕەت مەکەنەوە، لەبەر ئەوەی خاوەنی دین و ئەخلاق لەپێش هەموو شتێکەوەیە.

ئەگەر لەبەر جوانییەکەی بێت دڵنیاین لەوەی جوانییەکەی تاوەکو سەر نییە و پیر دەبێت، وەماڵیش تاوەکو سەر نابێت چەندەها خەڵک هەبووە خاوەنی ماڵ بووە پاشان خودای گەورە لێی وەرگرتۆتەوە، بنەماڵەش سوودی نییە بۆ مرۆڤەکان، ئەگەر کەسەکە خۆی باش و ئیماندار نەبێت چونکە پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: ﴿مَنْ بطَّأَ بهِ عملُهُ لمْ يُسرِعْ بهِ نسبُهُ﴾[1]. واتە: ئەوەی کەوا کردەوەی باشی نەبێت نەسەب و بنەماڵە هیچ سوودێکی پێ ناگەیەنێت.

بۆیە ئەوانەی قەومایەتی و بنەماڵە دەکەنە پێوەر هیچ لە حەقیقەت و ڕاستیی ژیان تێ نەگەیشتوونە، چونکە مرۆڤەکان هەموو وەکوو یەک نین، هەیە لە بنەماڵەی زۆر بەناوبانگن، بەڵام هەموویان جاهیل و نەزانن بە ئیسلام و دینی خودای گەورە.

[1] - بروانە: سەحیحی مسلم، ژمارەی فەرموودە (٢٦٩٩).

بۆیە خوشکی خۆم، خودای گەورە ئەوەی گرنگی پێ داوە لە بەندەکانی و هانی داون کە هاوسەری چاک هەڵبژێرن، خاوەن ڕەوشت، دین، داوێنپاک، خاوەن ئیمانێکی پتەو بێ و ملکەچی یاساکانی خودای گەورە بێت.

هەر بۆیە خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾[١] واتە: بەڕێزتر، نزیکتر و پایەبەرزترینتان لای خودا ئەو کەسەیە، کە زیاتر لە خودا دەترسێ و، خۆی دەپارێزێت لەئاست گوناه و تاواندا.

خوشکی من، ئەوە بزانە لە ئیسلامدا کە ماڵ و سامان، ناو و شۆرەت، شەهادە و ڕەچەڵەک و دەسەڵاتداری هیچ قیمەت و کێشێکی بۆ دانەندرێ.

ئەوەش بزانە زۆربەی زۆری ئەو گیروگرفتانەی دێنە پێش ژنهێنان و شوکردن هەڵبژاردنی هاوسەری ژیانە بەبێ لێکۆڵینەوە، بەدوواداچوون و سۆراغکردنی دین و ئەخلاق، چەند کوڕ و کچی لاو هەبوونە پەلەیان کردووە لە هەڵبژاردنی هاوسەرەکەیان، تەنیا لەبەر ئەوەی شەیدای جوانی نەسەب و بنەماڵەکەی بوون، کە بە هۆیەوە تووشی نەگبەتی و ماڵوێرانی بوون، بۆیە پەند وەربگرە و تێ مەکەوە!

پێویستە کە بەخۆماندا بچینەوە و چاو لە نموونەی هاوەڵانی خۆشەویست بکەین، کە چۆن گوێڕایەڵی فەرمانی پێغەمبەرەکەیان بوون ﴿ﷺ﴾ سوور بوون لەسەر فەرمانەکانی، بۆیە با چاو لە نموونەی کەسانی پێشینی سەلەفی ساڵح بکەین تا سەرفراز و بەختەوەری دونیا و قیامەت بین، با بەتەنیا شتێک بکەینە پێوەر بۆ ژیانێکی بەختەوەری بە ئیمان و ئەخلاق، با چاو لەو کچە بکەین کە چۆن گوێڕایەڵی پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ دەکات و قسەی دایکی

---

[١] - بڕوانە: سوڕەتی الحجرات، ئایەتی (١٣).

پشتگوێ دەخات، ئەمەیە نیشانەی ئیمانبەرزی ئیمانداری ڕاستەقینە بۆ هەڵبژاردنی کەسی تەقوادار هەموو قوربانییەک دەدات، تاوەکوو بەدەستی دەهێنێت.

بۆیە بەبێ (دین و ئەخلاقی بەرزی ئیسلام) هەر مەرجێکی تر بکەینە پێوەر ئەوە ژیانێکی خۆشمان بۆ نابێت، تەنیا ئیسلام و ئیمانە ژیری و ئەقڵ دەبەخشێت، تاوەکوو سەرکەوتوو بین بەسەر بەربەست و ناخۆشییەکان، کە دێنە بەردەم ژیانمان، بۆیە تاکە مەرج و ئاواتتان تەنیا با ئیمان بێت، ئەگەرنا چاوەڕێی ژیانێکی سەخت و دژوار بن، لەگەڵ کەسانێکی جاهیل و نەزان، کە تەنیا خەمی تێرکردنی نەفس و خۆشییەکانیان لەپێش هەموو شتێکەوە دادەنێن. ژیانێکی دۆزەخی و پڕ لە کێشە و گرفت بە ناچاری دەبێت بەڕێ بکەیت، یان جیا ببیتەوە. کە وایە بەدەستی خۆتانە خوشکی من، ئایا چ کەسێک هەڵدەبژێریت، کەسی دڵ پڕ لە ئیمان و سوڵحاو بۆ خودا، یان کەسی دڵ پڕ لە حەز و ئارەزووی دونیا و خۆشییەکانی؛ بۆیە ئاقڵ و ژیرانە بیر بکەوە تاوەکوو ژیانت لە دواڕۆژدا نەفەوتێ بەدەست خەم و ئازار و زۆری کێشەکان، لەبەر ئەوە پێویستە زۆر لێی بزانی.

## ئایە ئافرەت دەتوانێ خۆی پێشكەشی پیاو بكات.

ئافرەتیش هەر وەكو پیاو دەیان و سەدان ئاوات و خولیایی هەیە لە ژیانی دونیا، حەز لە زۆر شت دەكات بەدەستی بێنێت، ئێمە لێرە باسی ئافرەتی دوور لە دین و سفورەكان ناكەین، چونكە ئەوان ئەگەر ئاواتیان مێردكردن بێت و شووش بكەن، خۆیان دەفرۆشن لە پێناو گەنجی خاوەن پارە و جوانی و كەشخە و قۆزی و ناوبانگ، ئامادەن شوو بە گەنجی جاهیل و نەزان بكەن، ژیانیان خۆشدەبێ یان نە خەمیان نیە و گاڵتەیان پێدێ گەر تەڵاق بدرێن یان نە، چونكە لە دایک و باوكێک لە دایک بوونە دوور لە ئیسلام و هیچ فێری پەروەردە و ئەخلاق و ڕەوشت نەكراون، هەرچی حەزیان لێبێت دەیكەن، پیاسەو گەڕان و تێكەلاوی لەگەڵ كوڕ زۆر پێیان ئاساییە، بۆیە ئێمە لەم بابەتە باسی خوشكانێكی ئیماندار و دڵگۆشكراو بە ئیسلام و ملكەچی ڕێبازی پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەكەین، تاكو چاوكراوە و بەئاگابن و خۆشی دونیا و دوارۆژیان نەكەنە قوربانی دەستی گەنجە نەزان و جاهیلەكان.

ئایە دەكرێت خۆیان پێشكەش بە گەنجی ئیماندار بكەن، چونكە لەوانە باس و خواسی زۆر گەنج ببیستن كە ئیماندار و ئەهلی ئیسلامە و نموونەی نیە لە ئەخلاق بەرزیدا، بۆیە حەزدەكەن شوو بەو گەنجە بكەن تاكو لە ژیان بەختەوەربن، ئایە چیبكەین لەوكاتەی گەنجێكی ئاوا دەبینین.

سەرەتا بە كورتی باسی بەسەرهاتی خاتوو خەدیجەی دایكی ئیمانداران (ڕەزای خوای لێبێت) دەكەین كە چۆن شووی بە پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ كرد و چۆن خۆی پێشكەشی كرد و داوای لێكرد بیخوازێت، چونكە زۆر كەس بە نموونە دەیهێننەوە و خۆڵ دەكەنە چاوی كچان كە دەكرێت كچیش چاو لە خاتوو خەدیجە بكات، و خۆی پێشكەشی گەنجی بەناو موسڵمان بكات.

ئینجا با بەیەكەوە بچینە خزمەت هاوڕێیەكی نزیكی خاتوو خەدیجە كە ناوی نوفەیسەیە بۆمان ئەگێڕێتەوە كە خەدیجە ئافرەتێكی لێهاتوو و ماقووڵ و لەسەرخۆ بوو و، لە هەمان كاتیش دا خودای گەورە خێرو بێری زۆری بەسەری دا رژاندبوو.

لە هەمان كاتدا خاتوو خەدیجەی كچی خوەیلید بێوەژن بوو خاوەن پلەو پایەو سامان بوو، پیاوانی دەگرت بەكرێ بۆئەوەی بەپارەكەی بازرگانی بۆ بكەن، كاتێک هەواڵی پێغەمبەری ئازیزی ﴿ﷺ﴾ پێگەیشت چەند ڕاستگۆ و دەست پاک و ڕەوشت جوانە، داوای لێكرد دەربچێت بۆ شام و بازرگانی بۆ بكات كرێی باشترینی بۆ تەرخان دەكات لە كەسانی تر، ئەویش ڕازی بوو، ئینجا لەگەڵ مەیسەری خولامی خەدیجە دەرچوون بۆ شام، محمد ﴿ﷺ﴾ كاڵاو شتومەكەكانی خۆی فرۆشت، كە لە مەككەوە هێنابووی، ئەو شتومەكانەش كە دەیویست لەوێ كڕی و گەڕایەوە بۆ مەككە، ئیتر خاتوو خەدیجە ئەوەندە قازانجی كرد تا پارەكەی دوو بەرامبەر بوویەوە.

دوای ئەوەی کە مەیسەرە لەم سەفەرەی دا باسی لێبوردەیی و ڕاستگۆیی و ڕەوشت جوانی پێغەمبەری ئازیزی ﴿ﷺ﴾ بۆ کرد، ئینجا خاتوو خەدیجە قازانجێکی چاکی کرد لەو بازرگانیەدا، کە لەجارەکانی تردا نەیکردبوو، دوای ئەوەی ئەو خەسڵەتانەی بەدیکرد لە پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ خاتوو خەدیجەی ڕێزدار چووە لای نوفیسەی هاوڕێ و باسی بۆ کرد، کە لە دڵیدا هەستی پێدەکات بەرامبەر محمد ﴿ﷺ﴾ ئینجا نوفەیسە ئەنێرێتە لای پێغەمبەر خوا ﴿ﷺ﴾ تا بزانێ ڕای چییە.

نوفەیسە ئەپرسێ: ئەی محمد ﴿ﷺ﴾! بۆ چی ژن ناهێنی؟

ئەفەرمووێ: دەستم ناڕوا ژن بهێنم.

ئەڵێ: ئەی ئەگەر ئەوەت بۆ چارەسەر کرا و، سامان و جوانیی و ماقووڵیی و هاوشانییشت پێشکەش کرا، ئایا ڕازیی ئەبیت؟

فەرمووی: ئەوە کێیە؟

گوتی: خەدیجە.

فەرمووی: جا چۆن ئەوەم بۆ ڕێک ئەکەوێ؟

گوتی: لەسەر من.

فەرمووی: ڕازیی ئەبم.

خەدیجە مەواڵی بە کەس و کاری دا، ئەبینن مەموویان زۆریان پێ خۆشە.

ئەوە بوو کاتێکی بۆ پێغەمبەری ئازیز﴿ﷺ﴾ و کەس وکاری دیاریی کرد تا ئامادە بین..

پێغەمبەریش ﴿ﷺ﴾ ئەمەی بۆ مامەکانی باس کرد..

بۆ ئەم باسە هەردوو مامی ئەبو تالیب و حەمزە هەستان و چوون بۆ ماڵی خاتوو خەدیجە، ئەبینن کە عەمری کوڕی ئەسەدی مامی خەدیجە وا لەوێ ئامادەیەو، ئەبو تالیب خەدیجەی لێ خواست بۆ محمدی برازای و، عەمریش ڕەزامەندی نواند و خەدیجەی برازای پێشکەش کردن و دەری بڕی کە پیاوی وەک محمد ﴿ﷺ﴾ پێویستە پێشوازیی لێ بکرێ.[١]

ئەمە پوختەی بەسەرهاتی خاتوو خەدیجەی ڕێزدار بوو، دوای ئەوەی بۆی دەرکەوت پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ باشترین و چاکترین پیاوی سەردەمی خۆیەتی بە ڕاستگۆ و دەست پاک ناسراوە و هەرچی سیفاتی چاک و جوانە لێی کۆبۆتەوە، بۆیە داوای لە پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ کرد بیخوازێت.

بەڵام ئایە ئەمڕۆ کەسی چاک و باش بوونی هەیە کە کچ قوربانی بۆ بدات و داوای لێبکات و پێشنیاری بۆ بکات بیخوازێت.

ئێمە حاشا باسی نموونەی پیاوی وەکو پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ ناکەین، زمانمان لەقسە ئەکەوێ و خوار ئەبێ ئەگەر بڵێین پیاوی وەکو ئەو بوونی هەیە لەم سەردەمە، بگرە لە مێژووی مرۆڤایەتی هیچ مرۆڤێك نە لەپێش خۆیەوە نە لەدوای خۆی وەك ئەو نەبوە و نابێ، لەهەموو ڕوویەکەوە سەر مەشق و پێشەوای گشت مرۆڤایەتیە، بە دایك و باوك و قوربانی بین و فیدایی بین.

---

[١]- بڕوانە: السيرة النبويه لإبن أبن فارس لا (١٢٤)

ئینجا پێش هەموو شتێک دەبێ بزانین ئێستا سەردەم سەردەمی پیرۆزی پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ نیە، ئەو ڕۆژگار و كاتە بەسەر چووە كە نموونەیی ئەو هاوەڵانەی لەگەڵ پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ بوون كە چینی یەكەمی بڵاوكەری پەیام و بانگی ئیسلام و تەوحید بوون، شوێن پێ هەڵگری ئەو پێغەمبەرە ئازیزە ﴿ﷺ﴾ بوون، پیاوانێک بوون دین و بەرنامەی الله لە گیان و ماڵ و گشت شتێک لا گرنگتربوو، گشت هەوڵێكیان بۆ ئەوە بوو الله لە خۆیان ڕازی بكەن، خەمی سەرەكیان تەنها ئەوە بوو ڕۆژێک بەرێ بكەن عیبادەت و بەندایەتی تێدا كەم تەرخەم بن، واتە تەنها بۆ الله دەژیان لە خۆیان و گیان و ماڵ و ژن و خۆشی و هەموو شتیان خۆشببوون، بەڕاستی و دڵسۆزییەكی پاكانە خۆیان فرۆشبتوو بە الله، ئەگەر كردەوەیەكی چاكیان لەبیر كردبایە كە ئەنجامی بدەن، كە عوزر و بیانووشیان بۆ هەبوو، بەڵام ئەوان سەروەت و سامان و پارە و باخێكی زۆریان دەكردە بەخشین لە پێناو الله لە بری كردەوە چاكەكەی لە بیریان كردبوو، بۆیە ئەمانە قوتابیەكی گوێدار و دڵسۆزی پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ بوون، بۆیە لەم سەردەم و ڕۆژگارەی پڕی فیتنەیە هیچ نموونەیەک لە چاكی و باشی ئەو هاوەڵانە دووبارە نابێتەوە، كەسێک خۆی فرۆشتبێ بەالله و ژیانی قیامەتی لا گرنگتربێ لەم دونیا كاتیە مەحاڵە زووڵم و ستەم لە مێرووڵەیەک بكات چ جای خێزان و هاوسەری بێگومان هاوسەرەكەی دەخاتە سەرچاوی و ڕێزی دەگرێ و خۆشی دەوێت و بۆی دەبێتە هاوخەم و هاو دەرد و هاوبەشی گشت خۆشی و ناخۆشیەكانی ژیانی و

بۆیە نموونەی ئەم کەلە پیاوانە شایەنی ئەوەن هەموو ئافرەتان خۆزگەیان پێ بخوازن کە ببانە پیاویان و لەژێر دەستی ئەوان لەم دونیایە ژیابان.

ئێمە بوونی کەسی باش و ئیمانداری ڕاستگۆ زەربی سفر ناکەین، واتە گشت خەڵکی بەخراپ و زاڵم و ستەمکار بزانین و بێگومان نموونەی کەسی چاك و سوڵحاو بۆ الله هەیە، بەڵام زۆر کەم و نامۆن بوونیان زۆر کەمە.

بۆیە دەبێ خوشکانی ئیماندار زۆر وریابن لەم سەردەمەی پڕی فیتنەیدا بە کەس هەڵنەخەلەتێت کە خۆیان پێ موسڵمان و کەسی چاکە، دەبێ زۆر شارەزاو زۆر زان بێ و نابێت زوو باوەڕ بکات و ساویلکە بێت، هەر زوو بچی داوای لێ بکەی کە بتخوازێ، ڕاستە تۆ لە چاکی باشی و دڵسۆزی خۆتە کە خۆت پێشکەش کەسێ دەکەی کە ئەزانی ئیمانداره، لە پێناو ئەوەی ژیانێکی بەختەوەری لەگەڵ بەسەر ببەیت. بەلام وەکو گوتمان سەردەمی فیتنەیە و سەردەمی نەناسینەوەی چاکەو خراپەیە کەسانێک خۆیان کردووە بە بانگخواز و سەر ڕاستی خەڵکی، کەچی نەزان و جاهیلن بەو ئیسلامەی بۆ محمد ﷺ دابەزیووە، هەروا دەزانن دین کردنی دوو نوێژ و ڕۆژ و چەن زیکر و تەهیلیل و یادکردنەوە و مەولودە، تەواو تۆ ئیمانداری و بەهەشتیت، هەر شتێک مەسلحەتی دونیایی هەبوو ئەوان بە ئارەزووی خۆیان ئەنجامی ئەدەن، بەرنامەی ئیسلام کەم و زیاد ئەکەن و دەسکاری ئەکەن لە پێناو بەدەستهێنانی خۆشی دونیا، بۆیە دینی ڕاستەقینە نامۆیە، شوبهەو گومان و بیدعە و خورەفایات ئاسمانی پەردە پۆش کردووە، هەرووەکو هاوەڵی ئازاو

جوامێر حوزەیفەی کوڕی یەمان (الله تعالی لێی ڕازی بێت) ئاگاداری کردووینەتەوە لە ڕۆژگارێکی وەکو ئەمڕۆ، و باسی ئەم سەردەمەی بۆ کردووینە، کە دوو بەردی هەڵگرت و لەسەریەکی دانان (پێکەوە نوساندنی) ئینجا بە ماوڕێکانی گوت: ئایا هیچ ڕووناکیەک دەبینن لە نێوان ئەو دوو بەردەدا؟ گوتیان: ئەی باوکی عبدالله هیچ ڕووناکیەک نابینن ئیلا کەمێک نەبێت. حوزەیفەش گوتی: سوێند بەالله ڕۆژێک دێ بیدعە وا لەناو خەڵکدا سەرهەڵدەدا هەتاکو هیچ حەق و ڕاستیەک (لە دینی ئیسلامدا) نابینن ئیلا بەقەد ئەو ڕووناکیە کەمە نەبێت کە دەیبینن لە نێوان ئەم دوو بەردەدا، سوێند بە الله بیدعە وا بڵاو دەبێتەوە لە نێو خەڵکدا هەتا کاتێک وازبهێنیت لە کەمێک بیدعە، خەڵکی دەڵێن ئەو کەسە وازی لە سوننەت هێناوە، واتە چاکە دەبێتە خراپە و خراپەش دەبێتە چاکە.

(عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ: أَنَّهُ أَخَذَ حَجَرَيْنِ فَوَضَعَ أَحَدَهُمَا عَلَى الْآخَرِ ثُمَّ قَالَ لِأَصْحَابِهِ: هَلْ تَرَوْنَ مَا بَيْنَ هَذَيْنِ الْحَجَرَيْنِ مِنَ النُّورِ؟ قَالُوا: يَا أَبَا عَبْدِ اللَّهِ, مَا نَرَى بَيْنَهُمَا مِنَ النُّورِ إِلَّا قَلِيلًا , قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَتَظْهَرَنَّ الْبِدَعُ حَتَّى لَا يُرَى مِنَ الْحَقِّ إِلَّا قَدْرُ مَا تَرَوْنَ مَا بَيْنَ هَذَيْنِ الْحَجَرَيْنِ مِنَ النُّورِ وَاللَّهِ لَتَفْشُوَنَّ الْبِدَعُ حَتَّى إِذَا تُرِكَ مِنْهَا شَيْءٌ قَالُوا: تُرِكَتِ السُّنَّةُ)[1].

بۆیە ئەم ئاگادار کردنەوەی هاوەڵی ئازیز حوزەیفە ( الله تعالی لێی ڕازی بێت) ڕێک ئێستا هاتۆتە دێ و خەڵک ئیسلامی محمدی ﷺ ناناسێتەوە، هەموو

---

[1] - بروانە: كتاب البدع لابن وضاح...

بۆتە ئیسلامی فڵان حیزب و گرووپ و فڵان شێخ و فڵان مەڵا، بۆیە دەبێ زۆر وریابین لە ناسینی کەسەکان، چونکە تەنها کەسێک بەڕاستی دەستی بەو ئیسلامەوە گرتبێ کە الله پێی ڕازیە و موحید و یەک خواپەرستە لە حەقیقەت و ڕاستی ژیان تێگەیشتووە، ژیان لەگەل بەسەر بردنیان بەختەوەری و خۆشی بۆ مرۆڤ دەستەبەر دەکات، بۆیە ئەم جۆرەیان زۆر کەم و نامۆن و کەمینەیەکن، لە کەمی و نەبوونیان، نموونەیی تاڵە مویەکی سپین لە پشتی ڕەشە وڵاخێکی ڕەش.

بۆیە دەبێ بیزانین خۆ ژیانی هاوسەریەتی گاڵتەو کەپ نیە و هەر کەسێك گوتی موسڵمانم، تۆ پێی هەڵبخەڵەتیت تەواو با خۆم پێشکەشی بکەم و ڕازی دەبم پێی ئەم گەنجە باشترین مرۆڤە و پیاو چاکە چونکە موسڵمانە، بەڕاستی دەبێ خوشکان زۆر چاوکراوەبن چونکە ژیانی هاوسەریەتی پڕی ئەرک و مافە و نەک تەنها تێرکردنی حەز و ئارەزووی نەفس و جنسی، و گرتنی وێنەی سناپ و وێنەی یادی ڕۆژی مارەیی، بەڵکو پڕیەتی لە ماندو بوون و قوربانیدان و ئازار و خەم تاکو مردنە بۆ ڕۆژێک و دوو ڕۆژ نیە، بۆیە ئەگەر هاتوو زانیت گەنجێک هەیە دیندارە و یەکخواپەرستە و ئەهلی تەوحیدە دەتوانی لە ڕێگای کەسێکی نزیکت مەحرەمێک ئاگادار بکەیتەوە فلانە گەنج چۆنەو دین و عەقیدەی چۆنە ئینجا ئەو کاتە ئەگەر بۆتان دەرکەوت بەڵێ کەسێکی موتتەقی و ئەهلی ئیمانە و ئیسلام و ڕێبازی الله ی لە ژیانی و ترپەی دڵی خۆشتر دەوێیت، ئەوکات دەتوانی بە برات بلێی یان دایک و خوشکت، یان کەسێکی دڵسۆز و گوێگری

خەمەکانت و هاوخەمی دونیا و قیامەت، کە بە فڵانە گەنج بڵێت ئەگەر زەواج دەکەیت، من خوشکی خۆم یان کچی خۆمت پێشکەش دەکەم لەپێناو الله، یان بڵێت کچێکی ئاوا هەیە پێکەوە باسی تۆمان کردووە کە سپاس بۆ الله گەنجێکی دینداری بۆیە ڕەزامەند بووە شووتان پێ بکات، ئاوا بەم شێوەیە باشترە یان برات، خوشکت، یان هاوڕێی دڵسۆزت بە خزم و ناسیاوێکی کوڕەکە بڵێن کە فڵان کچ بخوازێت، هیچ شەرمی تێدانیە قوربانی دان بۆ کەسێکی ڕاستگۆ و ئیماندارێکی سوڵحاو بۆ الله، نەک بە خۆت بچی خۆت پێشکەشی بکەی و بڵێیت وەرە بمخوازە و شووت پێ دەکەم، ئەم ڕێگەم پێ باش نیە بۆ دوارۆژت چونکە دواتر دونیایە و مرۆڤ لەئاستێک کە نەگۆڕێت و شایەنی گۆڕانە، لەوانەیە لە داهاتوو کچی جوان ببینێ و بەدوای بکەوێت و پێی هەلبخەڵەتێ، بۆیە ئەوەی نەگۆڕێت تەنها مردووە کانن کە ناگۆڕێن و لە سەر بارێك مردوون خراپ یان باش، بەڵام زیندووەکان و ئەوانەی لەگەڵمان ئەژین هەمیشە ترسی گۆڕانیان لەسەرە، لە داهاتوو هەیە کەسی سپڵەو بێ وەفای لێدەر ئەچێ ئیلا ئەگەر الله ڕەحم بکات و نەگۆڕێت و ئەویش ئیمانێکی چاک و بتەوی هەبێت کەوای لێ بکات نەگۆڕێت و بەهەمیشە یەك هەلوێست بمێنێتەوە.

لە ڕاستی زۆرێک لە خوشکان لە پێناو الله داوای مارەیی کەمیان کردووە، لە گەنجاێکی بەناو موسڵمان کە ئەو خوشکانە داوای ئەلقەیەک یان یەک مسقاڵ زێر، یان لە سەر عەمرە و قورئانێک، مارە بکرێن بەڵام دڵنیاین ئەو

گەنجانەی ئەو خوشكانە خۆیان پێشكەشیان كردوون ئیماندارێكی چاك و پاك و ڕاستگۆ نەبوونە، بۆیە لە داهاتوو كە كێشەیەكیان كەوتۆتە نێوان یان تووڕە بووە لە ژنەكەی پیاوەكە پێی گوتووە تۆ شایەنی هەر هیچ نیت یەک ئەڵقە بۆتۆ زۆر بوو! ماڵەوەت لێت بێزار بووبوون بۆیە تاكو شوو بكەیت داوای ئەڵقەیەكت لێكردم!

واتە بەچاوی دەداتەوە و ئەو ئافرەتە بە كەم و سووكی دادەنێت، ئەم باسانە زۆر كەوتۆتە بەر گوێمان، كە پیاوانێک سپڵەو بێ وەفا دەرچوونە، بۆیە خوشكی بەرێزم لەپێناو الله ئەم ئامۆژگارییەمان بۆتۆ و سەرجەم خوشكانی ئیماندار بوو، كە لە ژیانی خۆتان بزانن و عاتیفی نەبن و زوو هەڵنەخەڵتێن، تا بە تەواوی لە عەقیدەو بیروباوەڕی گەنجەكە دڵنیا نەبیت نەكەیت قوربانی لە پێناو بدەیت، و دوارۆژی خۆت بفەوتێنی لەگەڵ گەنجی جاهیل و نەزان، وە بە تەواوی بۆت دەركەوت ئیماندارێكی سوڵحاوی ڕاستەقینەیە ئەوكات هەموو قوربانیدان و ئازارێكی لە پێناو بدە چونكە ژیانی خۆشی و بەختەوەر واتە بوونی ئەو لە ژیانت، بۆیە دەبێ لێزانین و چاوكراوە و بە ئاگا بین و حیكمەتمان هەبێت.

داواكارین لە الله تعالی زەواج بۆ هەموو لایەكمان ئاسان بكات كە زیاتر لە الله نزیک بینەوە و لەگەڵ چوونمان بۆ ژیانی هاوسەریەتی كار بۆ قیامەت و دوارۆژی نەبڕاوەی بەهەشت ببێتە كاری سەرەكی و خەمی هەمیشەیمان، تاكو سەرفرازی و ڕەزامەندی الله بەدەست دەهێنین.

# ئەی خوشکم، تاوەکوو کچی نرخ و بەهای خۆت بزانە.

لە سەردەمێکی یەکجار سەخت و دژواردایین، موسڵمانان لەو پەڕی دڵتەنگی و ناخۆشی و کێشە و نەهامەتیدانە، زۆربەی خەڵکی گومڕا و سەرلێشێواو بوونە، کێشەکان زۆر بوونە، مرۆڤ دەکوژرێ، زووڵم دەکرێ، خراپە و غەدر بەرانبەر یەک دەکرێ، ئەمەش بە هۆکاری پشتکردنمان لە ئیسلام حاڵمان گەیشتووەتە ئەو ئاستە ناخۆشە. خەڵکی ئیسلامیان ناوێ و دوای نەفس و خۆشییەکانی کەوتوونە، بۆ تێرکردنی حەزەکانی نەفسی هەرچی هەیە دەیدات پارە و سامانی، گیانی، دەبەخشێت بۆ ئەوەی خۆشی خۆی بەدەست بهێنێت.

پیاوە ژنی خۆی هەیە نرخ و قەدری نازانێ، لەپێناو خۆشیی نەفسی خیانەت و ناپاکی دەکات، بۆیە داوام وایە لەو خوشکانەی نەچوونەتە ژیانی هاوسەرێتی و خۆیان پێ موحیدە (یەکخواپەرست) ئەم ئامۆژگارییەم سوودی هەبێت بۆیان، تەنیا خوێندنەوە نەبێ، چونکە چەندان کچ هەبوون پێش چوونە ژیانی هاوسەرێتی لووتبەرز (خۆبەزلزان) بوون بەعاتفی بڕیاریان لە ژیانی خۆیان دەدا، بۆیە داهاتوویان فەوتاند لەگەڵ پیاوێک لەبەر جوانی و قۆزی، دەوڵەمەندی و ناوبانگ پێیان ڕازی بوون، نەک لەپێناو دین و دینداری و تەقواداری هەڵیانبژێرن، بۆیە سەرەنجام لێک جیا بوونەوە–تەڵاق دران، ئەمەی نووسیومە هەموو ڕاستییە و بەچاوی خۆم بینیومە و بە گوێی خۆم بیستوومە.

بۆیە هیوادارم دڵی کەس ئازار نەخوات، کە باسی حاڵی بێوەژن دەکەین بۆ ئەوەمان نییە لە نرخ و بەهای کەم بکەینەوە، تەنیا وەکوو پەند و ئامۆژگاریهێنانەوە بۆ ئەو خوشکانەی شوویان نەکردووە و، عاتفی و ساویلکەن

و بە خۆیان نەنازن و، فیز و كیبر لێ نەدەن ئەگەرنا لە داهاتوودا لووتیان دەشكێت. ئاقڵ، كەسێكە پەند و عیبرەت وەردەگرێت لە ژیان و تاقیكردنەوەی خەڵكی. ئەی ئەو كچەی، خۆت پێ گەورەیە، بزانە، كیبر و فیز زاڵە بەسەرت و بە خۆت دەنازیت، لایماڵەوە و خزم و هاوڕێكانت بە تەعلیق دەڵێیت: 'ئەگەر شوو بكەم دەیان كوڕ ئامادەیە شووی پێ بكەم'، خۆت هەڵدەكێشی؛ بەڵێ، دەیان كوڕ و زیاتریش هەن بتخوازن، بەڵام ئایا هەموو كوڕێك شایەنی ئەوەیە شووی پێ بكەیت، ئاگادار بە تۆ وەكوو كوڕ نیت یەك جارە شووكردنت، بۆیە بیزانە ڕەحمەتی خودا بڕژێ بەسەرتدا ئەی خوشكی من، چ گەنجێك هەڵدەبژێریت بۆ هاوسەرێتی، چونكە شووكردنت یەك جارە ئەگەر بێتوو پیاوەكەت تەڵاقت بدات، وەكوو پێشوو گرنگ نابیت لای كەسوكار و خەڵكیش، لەم كۆمەڵگەیەدا نرخی پێشووترت نامێنێ، گەنجەكان جارێكی تر ناهێنەوە داوات، مەگەر پیاوی خاوەن ژن، ئەوانەی دەكەنە دوو ژن و سێ یان ئەوانەی ژنیان مردووە، دێنە داوات بەكورتی ڕێز و قەدرت لەنێو خەڵكی وەكوو پێش شووكردنت نابێت و بە چاوی كەم سەیر دەكرێیت.

ئەوەی دەبێتە قوربانی تەنیا ئافرەتە، بۆ پیاو ئاساییە چەندان ژن دەهێنێ و تەڵاق دەدات، كەسێك دەناسم بۆی باس كردم، گوتی: 'پیاوێك چوار جار ژنی هێناوە و تەڵاقی داون، ئەوجا ژنی تری هێناوە'، دەیگوت: 'حەزم لێ بێت ئەمەش تەڵاق دەدەم و، كچی تر دێنم، زۆر لام ئاساییە'، واتە: گاڵتەی پێ دێ، دەیان كچ بێنێ و تەڵاقیان بدات، بۆیە تەنیا تۆی ئافرەت زەرەرمەندیی یەكەمیت.

كە وا بوو، بزانە شوو بە چ پیاوێك دەكەیت و، داهاتووت لەگەڵ چ پیاوێك بەسەر دەبەیت؛ پیاوێك كە نرخت بزانێت و بە سامان و سەروەت و گرنگترین

شتی دونیا نەتگۆڕێتەوە، بۆیە خوشکینە پێویستە بزانن چ کەس دەکەنە هاوسەرتان، دەیان و سەدان ئافرەت ئێستا ژیانی دۆزەخە و هیچ خۆشی نەبینیوە و پیاوەکەشی هەر لە ڕابواردن و چاتی کچ و تێرکردنی نەفسییەتی بۆیە ئەوەی زەرەر دەکات تەنیا تۆی ئافرەتیت.

بەڵێ، خوشکم تۆ تاوەکوو کچیت بەنرخیت هەرکات شووت کرد ئەگەر جیا بوویتەوە و تەڵاق درای ئەو کات نرخ و بەهای یەکەم جاری لەلای خەڵکی هەتبوو لەدەست دەدەیت، کۆمەڵگەی ئێستا نرخی ئافرەتی تەڵاقدراو (بێوەژن)ی لەلا کەمە لە ئاست کچ، خودای گەورە ئاگادارە بە نیەتی دڵمان کە نامەوێت لە نرخ و بەهای بێوەژن کەم بکەمەوە، ئەوانیش کەسوکار و خوشکی ئیمانی ئێمەن، بەڵام تەنیا ڕاستییەکان دەخەینە ڕوو، تاوەکوو تۆی کچ کە لە ئیماندا خوشکی منیت، بزانیت حاڵ و باس چییە و نرخی خۆت بزانیت و، ژیانت نەفەوتێ، چونکە وەکوو گوتم: هەتا کچ هەبێت گەنجەکانی ئەم سەردەمە بەلای بێوەژنەوە ناچن، ئێستا سەردەمی زێڕینی ئیسلام و هاوەڵان و تابعین و پێشەوایانی سەلەفی سالح نییە، کە دونیا لایان بێنرخ بێت و بێوەژن و کچی تەمەنگەورە بخوازن، بۆیە ئێستا سەردەمی بەدواکەوتنی دونیا، ژن ، پارە، ڕابواردن و خۆشییە.

بە هۆکاری بەرەڵایی، فیلمی دۆبلاژکراوی بەدڕەوشتی و ئەکتەرە بێئابڕو و گۆرانیبێژە فاشیلەکان، کە هەموویان ئێستا جوانکاریی دەستکرد بە دەرزی و دەرمان و ئەشیای دەستکرد کە جوانکاری لووت، لێو، ڕوومەت و هتد. دەکەن و جوانییەکەیان سروشتیی خۆیان نییە، بۆیە گەنجەکانیان سەرقاڵ کردووە و وا دەزانن دەبێ هەموو کچێ ئاوا جوان بێ، بۆیە ناچنە داوای کچی

تەمەن گەورە و بێوەژن، بەدوای کچی جوان و گەنج دەگەڕێت، مەلایەک هەیە هاوڕێی برادەرێکی نزیکمانە ئەو مەلایە ژن و منداڵی هەیە، داوای لەو هاوڕێیەم کردبوو کچێکی بۆ بدۆزێتەوە، بەس دەبێ کچەکە خاڵێک لە ڕوومەتی بێت، سبحان الله لەو بیرکردنەوەیە، واتە تەنیا حەزی لە کچێکە شووی نەکردبێ و خاڵێک لە ڕوومەتی بێ، ناچێ کچێک بێنێ کە تۆزێ تەمەنی گەورەیە، یان بێوەژنێ بێنێ لەپێناو خودا، بۆیە کابرا ژنی دووەمی هەیە ئاوات دەخوازێ بۆ کچی گەنج، جا ئەگەر ئەو وا بێ، دەبێ گەنجانی بێژن چۆن بن! بە هیچ شێوەیەک کچی بەتەمەن و بێوەژن ناهێنن، تەنیا خودا ڕەحم بکات، جا بۆیە سەردەمێکی زۆر سەیرە ڕۆژبەڕۆژ خەڵکی پشت لە ئیسلام و مردن و قیامەت دەکات، هەر ڕووە و دونیا دەچێ و سواری کەشتیی کاروانی دونیاویستان و نەفسپەرست و ئارەزوو بازان دەکەوێت، خۆشبەحاڵی ئەوەی لە کەشتییەکە دادەبڕێت و ڕووە و قیامەت و بۆ خودا هەنگاوی ژیان دەنێت. هەروەها هۆکارێکی تر کە گەنجان ئەو کچانە نەهێنن کە تەمەنیان گەورەیە و بێوەژنن، ماڵەوەی کوڕەکەیە، ناهێڵن کچی لەخۆی گەورەتر بێنێ، یان بێوەژنێ بێنێ بەخۆیان شەرمە کە کوڕیان لەو جۆرە کچانە بێنن؛ چەندان نموونەمان بیستووە لە ڕێگریی ماڵەوەی کوڕەکە، بۆیە سەردەمێکە کەس بەکەس نییە و لە نەبوونی حوکمی ئیسلام و دادگایەکی دادوەر کێشە و ناخۆشییەکان ڕوویان لە زیادبوونە، مەگەر تەنیا خودا ڕەحم بە حاڵمان بکات، زۆربەی گەنجان ماڵەوەیان ڕێگری دەکەن لە کوڕەکانیان کە کچی بێوەژن بێنن و ساردیان دەکەنەوە لە هێنانیان پێیان دەڵێن کوڕم کچ بە پەرۆشترە و خۆشەویستیی زیاترە بۆ مێردەکەی لە بێوەژن، چونکە یەکەم جارە دەگات بە پیاوێکی لەو

جـۆرە و یـەکتری دەناسـن، لەگـەڵ ئەوەشـدا ڕۆڵێکی گـەورەی هەیـە لـە ڕووی ئـارامی و دڵنیـاییی دەروونییـەوە، چونکـە تـۆ یەکـەم کەسـی دەچیتـە لای و ئاســوودە و بێخــەم دەبیــت، بــەڵام بــە پێچەوانــەوە بێــوەژن لەبــەر ئــەوەی هەڵســوکەوتی لەگـەڵ کەسـێکی تـردا کـردووە، بەتـەواوی ڕوو ناداتـە مێـردی دووەمی و خـوی پێـوە ناگرێ، خۆشەویستیی تەواوی ناداتێ و بەڕاستی و بەدڵ وابەستە نابێ پێیەوە، هەمیشە خەیاڵ و داڵغەی لای پیاوی یەکەمیەتی لەبەر ئـەو جیاوازییـە زۆرەی نێـوان ڕەوشـتی مێردی یەکـەمی و هەڵسـوکەوتی مێردی دووەمی، بەتەواوی گرنگی بەتۆ نادات.

بـەم قسـانە مێشـکیان پـڕ دەکـەن، بۆیـە بـەم شـێوەیە کوڕەکانیـان دوور دەخەنەوە لە هێنانی ئافرەتی بێوەژن، بێوەژنیان ناوێت. خوشکی بەڕێزم، تکایە تاوەکوو کچیت بەها و نرخی خۆت بزانە ئەمە خاتوو عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێت ) مانای هەموو ئەمانەی بۆ پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ ڕوون کردووەتەوە، لـە کاتێکدا کە پێی فـەرموو: 'ئەی پێغەمبـەری خـودا ﴿ﷺ﴾، ئەگەر بچیتـە ناو شیـو (دۆڵ)ێکەوە دارودرەختی لێ بێ، لەوەڕی لێ کرابێ و دارودرەختی وای لێ بێ لەوەڕی لێ نەکرابێ، حوشترەکەت لە کامیان دەلەوەڕێنی؟

پێغەمبــەری ئــازیز ﴿ﷺ﴾ وەڵامـی دایـەوە و، فـەرمووی: ﴿فِي الَّـذِي لَـمْ يُرْتَـعْ مِنْهَا﴾[1]. واتە: لەوەیان لێی نەخورابێ، عائیشـە (ڕەزای خـودای گەورەی لێ بێت) فەرموی: دەی ئەوە منم.

مەبەسـتی ئـەوە بـوو، فـەزڵی کچێتیی خـۆی ڕوون بکاتـەوە بەسـەر خێزانـەکانی تریدا بە حوکمی ئەوەی کە تەنیا ئەوی بەکچێتی هێناوە.

[1] - صحيح رواه البخاري، سلسلة الأحاديث الصحيحة (٥/٧.٣١.١٦).

ئێمە نامانەوێ بێوەژن بێنرخ و بێبەها بکەین، وەکوو گوتمان ئەویش هەر مرۆڤە و ئافرەتە، بەڵام خودا ئاگادارە تەنیا ڕاستییەکان دەخەینە ڕوو، تاوەکوو ژیانی موسڵمانان بێکێشە و ناخۆشی بێت، دەبێ ئەو ڕاستییە بزانین، زۆر بەی ئەو گەنجانەی ئافرەتی بێوەژنیان هێناوە لە داهاتوو بەختەوەر نەبوونە و کێشە و گرفت ڕووی داوە، ئەو پیاوەی کە بێوەژنی هێناوە لەلایەن ماڵەوە و خزم و کەسوکاری سەرزەنشت کراوە، لەبەر ئەوەی بێوەژنی هێناوە و پیاوەکەش لە دڵەوە ئاسودە نەبووە و، قەناعەتی نەهاتووە، تاوەکوو کچ نەهێنێت، بەم شێوەیە لەگەڵ ئافرەتەکە بووەتە کێشەیان کە ژنی بەسەر نەهێنێت، بۆیە کێشەکە گەورە بووە و دووبارە تووشی جیابوونەوە بووە، یان بەزۆر ڕازی کراوە کچی بەسەر هاتووە، بەڵام دوای هێنانی کچەکە بەردەوام ژیانیان شەڕ و ئاژاو و کێشە بووە. چونکە هەر کوڕێک سەرەتا بێوەژنی هێنابێت، دواتر چاوی بڕیوەتە سەر کچ و قەناعەتی نەهاتووە، تاوەکوو کچ نەهێنێت لەبەر ئەوەی کاریگەریی قسەی دەوروبەری لەسەرە، کە بێوەژنی هێناوە.

بۆیە خوشکی من کە هێشتا شووت نەکردووە بزانە چ پیاوێک هەڵدەبژێریت بۆ ژیانی هاوسەرێتی، کە گەنجی تەقوادار و ئەهلی ئیمان دێتە داوات دوودڵ و ڕاڕا مەبە و ڕازی بە پێیان، بۆ ئەوەی لە داهاتوودا پەشیمان نەبیتەوە، سەدان ئافرەت ئێستا حاڵیان گریانە و دڵیان پڕە لە خوێن و فرمێسکی حەسرەت دەڕێژن بەدەست پیاوانێک کە قەدر و ڕێزیان ناگرن و بێهەستن بەرانبەریان، ئاواتیان تۆزێک ناز و گرنگیپێدانە لەلایەن پیاوەکانیانەوە، کە ئیهمال کراون

هیچ نرخ و بەهایەكیان نییە لای پیاوەكانیان ڕۆژ دەچنە دەرەوە تا نیوەی شەو دواتر كە هاتنەوە خەریكی چاتی كچ و یاریی پۆپجی دەبن.
بەڵێ، سوێند بە خودا لە خەمخۆریی خۆمانە بۆ ئیمانداران ئەم قسانە دەكەین، نامانەوێت ژیانی تۆی موسڵمان ناخۆش، بەئازار و بەخەم بێت، پێمان خۆشە پیاوێكت هەبێ گرنگترین شتی ئەو بیت لە دونیا، ژیان لەپێناو خودا لەگەڵت بەسەر ببا، بۆیە خوشكی من تا گەنجی هەڵمەخەڵەتێ بەوەی تەمەنت بچووكە هێشتا ماوتە و كوڕی تەقوادار ڕەت بكەیتەوە،
چونكە وەكوو لە سەرەوە ئاماژەمان پێ دا، تەمەنت گەورە بێ گەنجەكان هەر سەیرت ناكەن، كە وایە، ڕەحمەتت لێ بێت بزانە چ گەنجێك دەكەیتە هاوسەفەری ژیانی دونیات، گەنجانێكی لە خوداترسی ڕاستەقینە كە ڕێز و پایەت لەسەر چاویان دانێن و بە سەروەت و سامانی دونیا نەتگۆڕنەوە، هەمیشە لێت نزیك بن و، لەخەم و ئازارەكانت بپرسن و ڕۆژانە دەیان جار خۆیان بە قوربانت بكەن، یان گەنجانێك تەنیا بۆ خۆشی و تێركردنی نەفس و حەزیان تۆیان بووێت، هەر كات تێر بوون ئیهمالت بكەن و لە دڵتەنگی و ئازار و هەستەكانت تێ نەگەن، بۆیە پاشەڕۆژ و دوارۆژی خۆت وێران مەكە بەوەی دوودڵ بی لە بڕیاردان لەسەر ئەو گەنجەی دیندارە، چونكە هەرچی ڕەحم و سۆز و میهرەبانی هەیە لای بەندە دڵسۆزەكانی خودای گەورەیە، ئەوانەی بەڕاستی خۆیان ڕادەستی خودا كردووە. كە وایە، ئەی خوشكی من، ئەگەر ژیر و ئاقڵ بووی و بەختەوەریی دونیا و دوارۆژت مەبەست بوو ئەم گەنجانە لەدەست نادەیت!

# ڕێگریکردن لە کچ زووڵمە، لەوەی بە دڵی خۆی شوو بکات

بەڕاستی تاوانێکی زۆر گەورەیە خوشکانێک گلەیی و گازندەی زۆریان لە باوک، برا و دایکیان هەیە، لەوەی کاتێک کوڕێکی دیندار دێتە داوایان ڕێگریی لێ دەکەن و ناهێڵن هاوسەرگیری لەگەڵ بکات، جا بە هەر بیانوویەک بێت؛ پێمان وایە ئەو باوک و برایانە تەنیا بێئەقڵی، نەزانین و جاهیلی دەماری مێشکیانی داگیر کردووە، بۆیە کچەکانیان دەچەوسێننەوە، چونکە باوک، برا و دایک دەبێت مەمنوونی ئەو گەنجە ئیماندارانە بن تاببنە زاوایان و ژیانی کچەکانیان بەختەوەر بێت، ئەو باوک و دایکانەی ڕێگری دەکەن لە کچەکانیان شوو بە گەنجە دیندارەکان بکەن، لە داهاتوودا خۆیان پەشیمانی و باجی هەڵەکانیان دەدەن چونکە کچەکەیان قەیرە دەبێت، یان دەیاندەن بە کوڕی دونیاپەرست و جاهیل.

لە داهاتوودا ژیانی خۆیان و کچەکەشیان وێران دەکەن بە خەم و ئازار و کێشە و گرفت، دەبێ هەموو کات بەرگەی ئەوەیش بگرن کچیان بێتەوە ماڵیان و بتۆرێ و زیز بێت لەدەست ئەو پیاوە خراپەی کە باوک و دایکی کچەیان بەزۆر بەشوو دا، بەو کەسە جاهیل و نەزانە.

لە ئیسلامدا زۆرلێکردن لە بەشوودان و ڕێگریکردن لە شووکردنی کچ بە ئارەزووی خۆی قەدەغە کراوە.

﴿ قال شيخ الإسلام (رحمه الله) فليس للولي أن يجبرها على نكاح من لا ترضاه ولا يعضلها عن نكاح من ترضاه إذا كان كفؤا باتفاق الأئمة و إنما يجبرها ويعضلها أهل الجاهلية والظلمة الذين يزوجون نسائهم لمن يختارونه لغرض لا لمصلحة المرأة, ويكرهونها على ذلك أو يخجلونها حتى تفعل ويعضلونها عن نكاح من يكون كفؤاً لها لعداوة أو غرض وهذا كله من عمل الجاهلية والظلم والعدوان وهو مما حرمه الله ورسوله و اتفق المسلمون على تحريمه﴾[١].

واتە: شێخی ئیسلام ئیبن تیمیە (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەفەرمووێت: بۆ وەلی (باوك) دروست نییە كچ ناچار بكات بۆ ئەوەی شوو بكات بە كەسێک كە ڕازی نییە شووی پێ بكات و، دروستیش نییە ڕێگەی لێ بگرێ شوو بە كەسێک بكات كە پێی ڕازییە، بە مەرجێ هاوشانی بێت بەیەكدەنگی پێشەوایان، بەڵكوو تەنیا نەفامەكان و ستەمكاران ناچاری دەكەن و ڕێگری لێ دەكەن، كە ئافرەتەكانیان مارە دەبڕن لە كەسانێک، كە خۆیان دەیانەوێ بۆ مەبەستێک، نەک بۆ بەرژەوەندی و بەختەوەریی ئافرەت؛ زۆری لێ دەكەن یان ڕووگیری دەكەن بۆ ئەوەی ڕازی ببێت و ڕێگری دەكەن لەوەی شوو بكات بە كەسێ كە هاوشانیەتی لەبەر ڕق و كینەیەک یان مەبەستێک، هەموو ئەمانە كردەوەی ئەهلی نەفامین و ستەم و ناحەزین و، خودا پاشان پێغەمبەرەكەی ﴿ﷺ﴾ حەرامیان كردووە و موسڵمانان یەكدەنگن لەسەر حەرامییەكەی.

[١] - بڕوانە: مجموع الفتاوى (٣٢/ ٥٢).

جارێک عەبدوڵای کوڕی پێشەوا عومەر (ڕەزای خوا لە خۆیی و باوکی بێ) داوای لە عومەری باوکی کرد تا داوای کچەکەی صالحی کوڕی نەححامی بۆ بکات، پێشەوا عومەر گوتی: ئەو بڕێ هەتیوی هەیەو تا ئەوانە وەستابن کچەکەی نادات بە ئێمە، بۆیە عەبدوڵای چوو بۆ لای زەیدی مامی و گوتی مامە داوای کچی فلانەکەسم بۆ بکە، زەیدیش چوو بۆ لای صالەح و گوتی عەبدوڵای کوڕی عومەر منی ناردووە بۆ داوای کچەکەت، ئەویش گوتی من بڕێ هەتیوم هەیەو ئامادە نیم کچەکەم بدەم بە ئێوەو برازاکانی خۆم لەولا وەستابن، بەڵام دایکی کچەکە حەزی دەکرد کچەکەی بۆ عەبدوڵا بێت، چوو بۆ لای پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ عەبدوڵای کوڕی عومەر هاتووەتە داوای کچەکەم، کەچی باوکی کچەکەی داوە بە هەتیوێک کە لایەتی و بەخێوی دەکات، هێشتا رای کچەکەشی وەرنەگرتووە، پێغەمبەریش ﴿ﷺ﴾ ناردی بە شوێن صالحدا و فەرمووی: (ئەرێ بێ ئەوەی رای کچەکەت وەربگریت داوتە بە شوو؟) گوتی بەڵێ، پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: **(أشيروا على النساء في أنفسهن و هي بكر)**، واتە: رای کچەکانتان سەبارەت بە خۆیان وەربگرن.[١]

کە وایە، زۆرلێکردن و ڕێگریکردن لە کچ و کوڕەکانمان گوناه و تاوانێکی گەورەیە لەوەی بە دڵی خۆیان هاوبەشی ژیانیان دیاری بکەن، زۆرێک لە باوک

[١] - بڕوانە: مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٥٥٤٢، حسنه شعيب الأرناؤوط.

و برا هەبوون بەزۆر کچیان داوە بەشوو، ئەم کچە لە ژیانیان دڵخۆش و بەختەوەر نەبوون بە هۆکاری زۆرلێکردنی ماڵەوەیان، خوشکێکی بەڕێز پرسیاری لێ کردین، کە پازدە ساڵە شووی کردووە، بەزۆرەملێی ماڵەوە ڕازی بووە، گوتی: 'هەر کات لەگەڵ هاوسەرم دەخەوم وا هەست دەکەم دەستدرێژی دەکاتە سەرم، پازدە ساڵە من ژیانم وایە دوو منداڵم لێی هەیە، ئایا من چی بکەم، لێی جیا ببمەوە؟ چونکە هیچ ناکەوێتە دڵم و ژیانم فەوتاوە، کە لەگەڵ ئەم پیاوەدا ژیان بەسەر دەبەم هیچ دڵم خۆش نییە، زۆر جار بیر لە خۆکوشتن دەکەمەوە بۆ ئەوەی ڕزگارم بێت، بەڵام لە خەمی منداڵەکانم ئەژنۆم شکاوە، نازانم ڕووم بکەمە کوێ!'

بە داخەوە زۆرێک لە باوک و برایان زۆرلێکەرن لە کچەکانیان و بەزۆر دەیاندەن بە کوڕی مام و خزمەکان یان ئەو کوڕەی خۆیان بەدڵیانە گرنگ لایان نییە، کچە ڕازییە یان نا، لە کاتێکدا کچە ڕازی نییە و بەدڵی نییە، کە تۆ بەزۆر ڕازی دەکەی، ئەوە ژیانی دەخەیتە دۆزەخ و ناخۆشی و خەم و خەفەت، چونکە ژیانی هاوسەری تا مردنە، وەکوو دۆزەخ و بەهەشتە، دۆزەخەکەی ئەوەیە، پیاوێکی زاڵم، خراپ، دڵڕەق و دوور لە دین ببێتە هاوسەری، یان بەزۆر ڕازییان کردبێت شوو بکات، بۆیە ژیانی دەفەوتێت و خۆشی و ئاسوودەیی لە ژیانی ماڵاوای دەکات بە هۆی خراپی پیاوەکەیەوە.

بەهەشتەکەشی ئەوەیە، ئەم کچە پیاوێکی دیندار بکاتە هاوسەری و، لەگەڵیدا ژیانێکی بەخەوەر و دوور لە ناخۆشی بەڕێ بکات و دڵخۆش و ئاسوودەیی بکاتە میوانی دڵی بۆ هەمیشە.

بەڵام ماڵەوەی زۆربەی کچان، ڕێگرن؛ لەبەر ئەوەی شوو بە کوڕێک دەکات دینداره و کچەش بە دڵیەتی.

ئەم بەسەرهاتە مامۆستایەکی کوردی بانگخوازی ئیسلامی–کە لە ئەوروپا دەژیت، زۆر چاک دەیناسم، تەقوادار و متمانەپێکراوە– لێرەدا وەکوو نموونەیەک دەیهێنینەوە بۆ ئەوەی ببێتە پەند و وانە بۆ ئەو باوک و دایکانە کە ڕێگری لە کچیان دەکەن شوو بە گەنجی دیندار و هەژار بکات.

ئەم بانگخوازە گوتیشی: 'ماوەیەک لەمەوبەر بابەتێکمان نووسی بوو لەسەر ئەوەی کە پێویستە دایکان و باوکان کچەکانیان بدەن بە گەنجی ساڵح و لە خوداترس.

دوای ئەوە ئافرەتێکی بەڕێز نامەیەکی ناردبوو کە خاوەن سێ کچە و هەرسێکیانی داوە بەشوو، تەنیا لە یەکێک لە زاواکانی زۆر ڕازییە، بۆی نووسیبووم: 'مامۆستا خۆزگە دەرگابەدەرگا خۆم بەدوای نموونەی ئەم زاوایە گەڕابام، بۆ ئەوەی دوو کچەکەی تریشم دابایە بە گەنجێکی ئاوا چاك، ساڵح و ئیماندار.'

نووسیبووی زۆر خوازبێنی کچەکانم دەهات، بەڵام منی نەفام هەر لەدوای شوهرەت و پارەو سامان و کەسی دەوڵەمەند بووم تا بیاندەمێ، هیچ لە بیری ئەوە نەبووم ڕازیش نەدەبووم بیاندەم بە گەنجێکی هەژاری ساڵح و ئیماندار!

گوتی: دووجار ئەم گەنجە ئیماندارە کە ئێستا زاوامە زۆر زۆر خۆشم دەوێ هات بۆ خوازبێنی کچەکەم هەر ڕەتم کردەوە چونکە حاڵی ئابووریی باش نەبوو؛ جاری سێیەم کە هات بە هۆی هەندێ کەس، خزم، براکانم و ڕەزامەندیی کچەکەم، بەدڵگرانی ڕازی بووم و، کچەکەم دایێ.

بەڵام دوای ئەوە بەتێپەڕ بوونی کات زانیم کە ئەم گەنجە ئیماندارە زۆر زۆر چاکترە لە هەردوو زاواکەی ترم کە دەوڵەمەندن و لەبەر ناوبانگ و پارە کچم دانێ، کە هەردوو کچەکەی ترم لە ناخۆشی، کێشە و هەرادان بەردەوام دێنەوە لام دەتۆرێن و زیز دەبن، ئەگەرچی سەیر دەکەم کچی بچووکم کە داومە بەم پیاوە ئیماندارە سپاس بۆ خودا خاوەن دوو منداڵن و، ئەگەرچی بەکرێکاری نان پەیدا دەکات.

ئەم گەنجە لە ڕووی داراییەوە هەژارە، بەڵام ماڵەکەیان بەهەشتێکە ئاسوودە ترین خانەوادەن.

تا ئێستا کچکەم گلەییەکی بچووکی لێ نییە، پاشان لەسەر ئەم هەموو چاکەیە بۆ کچەکەم، ئەوجا ڕۆژێک نامەیەکی جوان و ناسکی بۆم نووسی بوو کە منداڵەکانی خۆم ئەوەیان بۆم نە نووسیوە!

بۆی نووسی بوم-:

بسم الله الرحمن الرحيم..

دایكم،

ئەی خۆشەویسترین دایك...

چۆن بانگت ناكەم دایكم، كە تۆ خۆشەویسترین مرۆڤت پێشكەش بە دڵم كردووە.

چۆن بە دایكم بانگت ناكەم، كە تۆ ئەم ئافرەتەت هێناوەتە بون.

ئەو هاوڕێیەی كە ژیانی داگیركردووم ...

من بەختیارترین مرۆڤی دونیام...

ئەوەندە بەختەوەرییەم بەسە كە هەموو ژیانم لەگەڵ ئەم كچە دەبەمە سەر كە چەندان ساڵە لێی دەگەڕێم، لەگەڵ ئەو كچەی تۆ، كە بووە بە هاوسەرم و دایكی منداڵەكانم، تۆ كچەكەت داوەتە من بەڵام من دڵ و گیانم داوەتێ.

كە خوێندمەوە لەشم هاتە لەرزین و دەستم كرد بەگریان، چۆن گەنجێک كە ئاوا دژی وەستامەوە هیچ ڕێزم نەگرتووە؛ تا ئێستا وەكوو پێویست بەم شێوەیە بێت بەرانبەر كێ؟ خەسووی! كە هەموومان دەزانین خەسوو و خەزوور ڕەزایان گرانە لای زاوا، بەڵام ئێستا تێگەیشتم ئەوەی كچەكەی نەدا بە كەسی ساڵح و ئیماندار دەستی دەچێ و لەخۆڕا ماڵی وێران دەبێ. "

بەڵێ، ئەمە فەرموودەكەی پێغەمبەری ئازیزە ﷺ كە ئاگادارمان دەكاتەوە دەربارەی ڕەچاونەكردنی هیچ پلەوپایە و مەنسەب و مەبەستێكی دونیایی و

تەنیا دین و ئەخلاق نەبێ و، دەفەرمووێ: ﴿ **عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﴿رضي الله عنه﴾ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ (إِذَا خَطَبَ إِلَيْكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ دِينَهُ، وَخُلُقَهُ فَزَوِّجُوهُ، إِلَّا تَفْعَلُوا تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ، وَفَسَادٌ عَرِيضٌ**﴾[1]. واتە: ئەبوو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێت)، دەڵێ: پێغەمبەری ئازیز ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ فەرموویەتی: ئەگەر یەكێک خوازبێنی كچەكەتانی كرد و ئێوەش لە دین و خوڕەوشتی ڕازی بوون، ئەوا بیدەنێ ئەگەر نەیدەنێ ئەوا فیتنە و ئاشووب لەسەر زەوی بڵاو دەبێتەوە و لە دواییشدا پەشیمانی و نەهامەتییە.

ئەو گەنجەی پێبەندی فەرمانەكانی ئیسلام دەبێ و شتێک كە قەدەغە كرا بێ خۆی لێ دوور دەخاتەوە، ئەو پیاوە هەڵسوكەوت و مامەڵە و ڕەفتاری بەرانبەر خێزانەكەی چاک و باش دەبێت و ڕێزی ئافرەتەكە، دایك، باوک و خانەوادەكەی دەگرێ و خۆشی دەوێ و، دەبێتە پارێزگاری خێزانەكەی لە هەموو بوارەكاندا.

خوشكی بەرێزم (ڕەحمەتی خودا بڕژێ بەسەرت)، پیاوی ساڵح و ئیماندار ئەگەر ژنەكەشی خۆش نەوێت هەر ڕێز و حورمەتی دەگرێ و بە چاوی سووک سەیری ناكا و لای خەڵكی گاڵتە و یاری بە هەستی ناكات، بەجوانی لەگەڵی دەجوڵێتەوە و خراپ نابێت.

[1] - بروانە: سوننەی الترمذي، ژمارەی فەرموودە (١٠٨٤) ، و ابن ماجة، ژمارەی فەرموودە (١٩٦٧).

چونکە پێغەمبەری ئازیزمان(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿لَا يَفْرَکْ مُؤْمِنٌ مُؤْمِنَةً إِنْ كَرِهَ مِنْهَا خُلُقًا رَضِيَ مِنْهَا آخَرَ﴾[1]. واتە: پیاوی بڕوادار با ڕق و کینەی بەرانبەر بە ئافرەتی بڕوادار نەبێت، گەر لە ڕەوشتێکی ناڕازی بێ و شتێکی پێ ناخۆش بێ، ئەوە ڕەوشتێکی تری بەدڵە و ڕازی دەکات.

سەیر بکەن، کە چ ئامۆژگارییەکی حەکیمانەیە بۆ گەنجان، کە دوودڵ نەبن لە کەسی ئیماندار، باوک و دایکان چیتان ماوە ڕێگری بکەن لە گەنجی ساڵح و تەقوادار کە ڕەتی بکەیتەوە بۆ کچەکەت!

بیزانە تەنیا ئیسلام و ئیمان گرنگن و لە دونیادا مایەی بەختەوەرینە.

دەبێ باوکان چۆن خەمی ئەوەیانە کچی چاک بۆ کوڕەکانیان بدۆزنەوە، بە هەمان شێوە خەمی ئەوەشیان بێ، کوڕی چاک و دیندار بۆ کچەکانیان بدۆزنەوە، دەبێ مەمنوونی خودا بن کە کوڕی دیندار و چاک داوای کچەکەیان بکات، ئەگەر سەیری سەلەفی ساڵح بکەین، پێشینە چاکەکانمان چەندە سوور بوونە لەسەر ئەوەی کچی خۆیان تەنیا بە گەنجی ئیماندار و تەقوادار نەبێ نایدەن.

ئەمە نموونەیەک لە باوکانی سەلەفی ساڵح کە چۆن کوڕی چاکیان دۆزیوەتەوە بۆ کچەکەیان، ئەوە سەعیدە یەکێکە لە زانا هەرە بەرزەکانی تابعین (ڕەحمەتی خودای گەورەی لێ بێت) عبدالملکی کوڕی مەڕوان خوازبێنی کچەکەی دەکات بۆ کوڕەکەی خۆی وەلیدی کوڕی عبدالملک.

[1] - سەحیحی مسلم، ژمارەی فەرمووده (١٤٦٩).

کچەکەی سەعیدیش جوانترین کچی سەردەمی خۆی بوو و، شارەزاییەکی زۆری هەبووە لە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾، بەڵام سەعید بێ سێ و دوو خوازبێنییەکەی ڕەت کردەوە، لەگەڵ ئەوەشدا عبدالملکی کوڕی مەڕوان کە خەلیفەی موسوڵمانان بوو.

بەو هۆیەوە سەعیدی خستە نێو ئازار و ئەشکەنجەیەکی زۆرەوە، هەتا دەڵێن: سەد داری لێ دا، کە زانی خوازبێنی وەلیدی کوڕەکەی ڕەت کردووەتەوە.

بەڵام زانای پایەبەرز و شارەزا، گەڕایەوە مەدینە بۆ مزگەوتی پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ یەکێک لە قوتابییەکانی بە ناوی (عبداللّهی کوڕی ابو وداعة) بە کوڕی ابو وداعة ناسراو بوو، هاتە لای و، بوو بە قوتابیی سەعید، بەردەوام لە کۆڕی ئەو دادەنیشت گوێی لە ئامۆژگاری و دەرسەکانی دەگرت.

ڕۆژێک ابو وداعة ئامادەی دەرسی سەعید نەبوو، پرسیاری کرد لە کوێ بووی ئەم سێ دانە ڕۆژە دیار نەبوویت؟

گوتی: ئەی پێشەوام، خێزانەکەم وەفاتی کرد منیش سەرقاڵی پێداویستییەکانی پرسە و بەخاکسپاردنی بووم.

سەعید گوتی: بۆچی بە شوێن منتدا نەنارد، تا بێم لەگەڵت بەشداری بکەم؟ ئایا ئێستا هیچ هاوسەرێکت بۆ خۆت پەیدا کردووە؟

ابو وداعة گوتی: ڕحمەتی خودات لێ بێت جا کێ لێم مارە بکات، خۆ من هیچم نییە جگە لە دوو درهەم یان سێ درهەم.

سەعید گوتی: من لێت مارە دەکەم.

گوتی: تۆ؟

بەڵێ، من لێتی مارە دەکەم.

ابو وداعة، دەڵێ: ئەو شەوە لە خۆشییان چاوم نەچووە خەو، هەر ئەو وشەیەم لەبن گوێدا دووبارە دەبووەوە (من لێتی مارە دەکەم). سەعید چووە لای کچەکەی، بەڵام چ کچێ! نموونەی زانای بەناوبانگی سەردەمە، دەڵێ لێی بە ژووریَ کەوت، گوێی لێ بوو قورئانی دەخوێند، گەیشتە ئەم ئایەتە ﴿رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾ [1]. واتە: هەشیانە کە دەڵێت: پەروەردگارا لە دونیادا خێر، چاکە، ناز و نیعمەتمان پێ ببەخشە و، لە قیامەتیشدا لە ناز و نیعمەتەکانی بەهەشت بەهرەمەندمان بکە و، لە سزای ئاگری دۆزەخیش بمانپارێزە.

گوتی: باوکە دەزانم چاکەی دوارۆژ و قیامەت مەبەستی بەهەشتە، بەڵام چاکەی دونیا چییە، کە لەم ئایەتەدا باسی لێوە دەکات؟

سەعید گوتی: کچم چاکەی دونیا پیاوێکی باشە بۆ ئافرەتێکی باش، کچەکە تێ گەیشت لە مەبەستی.

ئینجا ماتە مزگەوت لەدوای نوێژی عەسر بە ئامادەبوونی قوتابییەکان و نوێژخوێنەکان، گوتی: خودا پاشان ئامادەبوانم کردنە گەواهیدەر، کە کچی خۆم (فلان)، کردم بە هاوسەری ابو وداعة لەسەر بەرنامەی خودای گەورە پاشان پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ کە ئێوارە داهات ابو وداعة گەڕایەوە بۆ ماڵ بۆ ئەوەی ڕۆژووەکەی بشکێنێ هەندێ خورما و زەیتی هەبوو لە ماڵ، لەناکاو یەکێ لە دەرگای دا، گوتی: کێیە؟

گوتی: سەعیدە. دەڵێ بیری هەموو سەعیدێکم کرد، تەنیا سەعیدی مامۆستام نەبێ. ئەوەش لەبەر ئەمە بوو، کە ماوەی چل ساڵ نەبیندرا جگە لەنێوان

---

[1]- بڕوانە: سوڕەتی البقرة، ئایەتی (٢٠١).

مزگەوت و ماڵەکەی خۆی نەبێ، چووم بۆ کردنەوەی دەرگا، گوتم، بزانم کێیە، کە بینیم سەعید بوو.
پێم گوت: ها خێرە بۆ بە شوێنی منتدا نەنارد بۆ بە خۆت هاتی هەندێ جاریش دەمگوت لەوانەیە پەشیمان بووبێتەوە کچی پێم داوە.
ئینجا سەعید گوتی: نا من ئەولاترم کە بێمە لات، نەک تۆ.
گوتم: چ فەرمان دەکەیت؟ گوتی: تۆ پیاوێکی بێ ژنی نامەوێ ئەم شەو بەتەنیا ببەیتە سەر، ها ئەوە خێزانەکەت بە جلوبەرگی خۆی ابو وداعة بینی کچەی لە پشتی وەستاوە دەستی کچەکەی خۆی گرت و خستییە پشت دەرگایەکە و منیشی بە ژوورێ نا ئینجا ڕۆیشت.
دەڵێ ئەم ئافرەتە کە چاوی بە من کەوت لە شەرمان کەوتە خوارێ، منیش گوتم بەیارمەتیت لەم دەرگایە ڕاوەستە هەندێ ئیشم لە ژوورێ هەیە. چوم نان و زەیتەکەم لەلای چرایەکە لابرد، بۆ ئەوەی چاوی پێ نەکەوێ، ئینجا بەسەر بانەکە کەوتم بانگی جیرانەکانم کرد هەموویان کۆ بوونەوە گوتیان چیتە؟
گوتم: مامۆستا سەعید کچی خۆی دایە من، ئەم شەو بەخۆی بۆ منی هێنایە ماڵەوە، کە ئێوە ئاگاتان لێ نەبووە؛ باوەڕیان پێ نەکردم، گوتیان سەعید کچی پێ داوی؟ گوتم: بەڵێ، هاتنە ماڵم دایکی منیشیان بەخەبەر هێنا، ئەویش هات. گوتی: ڕووم لە ڕووت حەرام بێ ئەگەر دەستی لێ بدەیت، تاوەکوو سێ ڕۆژی تر جوان بۆت ساز دەکەم ئینجا دوای سێ ڕۆژەکە بینیم، زانای وەک خۆی نییە، لەسەر ڕووی زەوی، جوانی وەک خۆی نییە لەنێو ژنان، شاژن بوو قورئانی هەموو لەبەر بوو بە تەفسیرەوە چەندان هەزار فەرموودەی لەبەر

بوو، لە هەموو کەسێ شارەزاتر بوو بە بەخشینی مافی ژن و مێردایەتی یەک هەفتە لە ماڵ لەگەڵی بووم، وەم دەزانی لەنێو باغی بەهەشتم ئینجا لەدوای هەفتەکەدا گوتم: دەبێ بە هۆی دەرسەکانمەوە بچمە لای مامۆستا سەعید، کچە گوتی: لێرە دانیشە فێری ئەو زانستەت دەکەم کە سەعید فێرت دەکا، لەپاش مانگێک نەچوومە لای سەعید.

ڕۆژێک چووم سەلامم لێ کرد، بەڵام تەنیا وەڵامی سەلامی دایەوە هیچ قسەی لەگەڵ نەکردم، کە کۆڕەکەی کۆتایی پێ هات، گوتی: ها وەزعی ئەم ئینسانە چۆنە؟ گوتم: ئەی ابو محمد زۆر باشە چوومەوە ماڵی خۆم لە پاشان ڕۆژێک سەعید هاتە لام بیست هەزار (٢٠٠٠٠) درهەمی بۆ هێنام.[١]

ڕەحمەتی خودای گەورە لە باوکی ئاوا بێت، بە داخەوە بۆ باوک و برایانی ئێستاکە کچی خۆیان دەفرۆشن بۆ پارە و ماڵی دونیا، کە زانییان مەسڵحەت و قازانجێک هەیە لەو گەنجەی دەبێتە زاوایان ئەوە کچیان پێی دەدەن، ئەگەر نوێژنەکەر و کافر و شەلاتی و نەزانیش بوو، بۆیە ژیانی کچیان دەکەنە قوربانیی حەز و ئارەزووی نەفسیان و وێرانی دەکەن.

بەو باوک و برایانەش دەڵێین، کە ڕێگری دەکەن لە کچیان شوو بە کوڕی ئیماندار بکەن و بەبێ هۆ کچیان نادەن بەشوو با لە خودا بترسن، گوناهیان دەگاتێ کچیان نەدەن بەشوو؛ بەسەرهاتی ئەو کچانەی کە قەیرە بوونە، زانایان دەیگێڕنەوە، پیاوێک کچەکەی نادات بەشوو، تا دەگاتە تەمەنی (٢٧) ساڵی، کچەکە تووشی نەخۆشی نەفسی و لاشەیی دەبێت، تا ئەو ڕادەیەی

[١]- بڕوانە: الحلية لأبي نعيم (٢/ ١٦٧و١٦٨).

دەیخاتە جێگە، کاتێ گەیشتە سەرەمەرگ ئەم بەستەزمانە گوتی: 'کوا باوکم؟' باوکی هات، پاشان کچەکە گوتی: 'باوکە، دوعایەک دەکەم بڵێ ئامین'، گوتی: 'ئامین'، کچەکە گوتی: 'جارێکی تریش بڵێ ئامین'، جارێکی تریش گوتی: 'ئامین'؛ هەتا چوار جار پێی دووبارە کردەوە، ئەوجا کچەکە گوتی: خودای گەورە بەهەشتت لێ حەرام بکات، وەک چۆن لە هاوسەرگیری بێبەشت کردم'، پاش ئەم قسەیە کچەکە مرد.

چەند گوناهن ئەو خوشکانەی بەو شێوەیە ماونەتەوە! دەبێ ژیانیان چۆن بە نارەحەتی و خەمەوە بەرێ بکەن، کە بوونەتە قوربانیی دەستی باوك، برا و خزمەکانیان، لە بێبەشبوونیان بە کەسی چاک لە ژیانی هاوسەرێتی وەک کچانی تر...

هەندێک قەیرەکچی تریش لە سەرەمەرگ بە باوکیان گوتووە من و تۆ لە بەر دیوانی خودای گەورەدا ڕاماندەگرن لە ڕۆژی قیامەتدا من لێت خۆش نابم، چونکە منت بەشوو نەدا.[1]

بەڵێ، هەموو کوڕ و کچێک مافی خۆیەتی و ئازادە نابێ کەس ڕێگری لێیان بکات، لەوەی بۆ خۆیان ژیانی هاوسەرێتی پێک بهێنن وەک هەموو مرۆڤێك، بۆیە ئەی باوک و برایان، ئەی ئەوانەی دەبنە ڕێگرن لەبەردەمیان، چۆن ناترسن لە دوعای ستەملێکراو کە پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ ئاگادارمان دەکاتەوە، دەفەرمووێ:

---

[1] - بڕوانە: کتێبی قوربانییەکانی خۆشەویستی، ل. (١١٤).

﴿وَ اتَّقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ فَإِنَّهُ لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ اللَّهِ حِجَابٌ﴾[1]. واتە: بترسن لە دوعای ستەملێکراو، چونکە هیچ بەربەستێک نییە لەنێوان خودای گەورە و دوعای ستەملێکراو.

منداڵەکانتان ئەمانەتن لاتان لە خودای گەورە بترسن لەوەی بەبێ هۆ نایاندەن بەشوو، هەتا زووە ئەگەر داوای هات، کوڕێکی دیندار بوو، کچەکەتان پێی ڕازی بوو، بە هیچ شێوەیەک ڕێگرییان مەکەن، دواتر خۆتان پەشیمان دەبنەوە، کە ئەو کاتیش پەشیمانی هیچ سوودی نییە، تەنیا خەم، خەفەت و ژانە، کچەکانیش کە دەزانن باوک و برایان بۆ کوڕی ئیماندار ڕێگرن، با بێدەنگ نەبن لەسەر مافی خۆیان و قسە بکەن، باوک و برای جاهیل ژیانی خۆیان خۆشە و ژنی خۆیان هەیە بەردەوام لە گەڕان و ڕابواردنن، بۆیە دەبێت قسە بکەن لەسەر مافی خۆیان، لە زۆر کەسمان بیستووە کاتێک کوڕێکی دینداری ئەهلی ئیمان چووەتە داوای، بەڵام ماڵەوەی کچە ڕێگر بوونە بەدڵیان نەبووە، باوک و برای کچە جوابی کوڕەکەیان داوەتەوە کە کارەکە نابێت، بۆیە کچیان هێشتووەتەوە، کەچی بە کچەکەیان گوتووە بۆچی بە فلان ڕازی نەبوویت؟ گوتوویەتی ماڵەوە ڕازی نەبوون و قسمەت نەبوو، واتە: خۆی بێدەنگ دانیشتووە لە ماڵ بەبێ ئەوەی هیچ هەڵوێست و قسەی هەبێت؛ بڵێت، بابە گیان زانیومە کوڕێکی دیندارە و من ڕازیم بە کەسی ئیماندار، ئەوەشم بیستوومە لەسەری کە گەنجێکی تەقوادارە، بۆیە بابە گیان ڕەتی مەکەن، نابێ بێدەنگ بیت و، بڵێیت قسمەت نەیویستووە، ئێ ئەوە کوڕە هاتووەتە داوات بەڵام خۆت بێدەنگ کردووە و،

[1] - بڕوانە: سەحیحی بوخاری، ژمارەی فەرمووده (١٤٩٦).

لە لێواری دەریا بەبێ خەمی خەوتووی، هەروەک ئەو کەسەی لە ماڵەوە پاڵی داوەتەوە، دەڵێت: خودا ڕزق و ڕۆزیدەرە و، هیچ جوڵە و ئیشێک ناکات و بەتەمای ئەوەیە شتێکی بێتە دەست، ئەمە تەنیا فێڵلەخۆکردن و هەڵخەڵەتاندنە، بێگومان ڕاستە خودا ڕازق و ڕۆزیدەرە بەس کە تۆ جوڵەیەک نەکەیت و هەوڵی کارێک نەدەیت چۆن پارە و شتت دێتە دەست! بۆیە دەبێت جوڵە بکەیت و کار بکەیت ئەو کات خوداش یارمەتیدەرت دەبێت و لەسەر بەدەستهێنانی ڕزق و ڕۆزی ئاسانکاریت بۆ دەکات بە جۆرێک نەزانی چۆن بەم شێوە دەوڵەمەند بوویت. خوشکی بەڕێزم تۆ کە خوازبینیت دێت، ماڵەوە بەبێ ئەوەی پرست پێ بکەن وەڵامی کوڕە دەدەنەوە کە قسمەت نابێت، تۆیش دەزانی کوڕە چاک و دیندارە بەس دەڵێیت قسمەت نەبوو، خوشکی من بیزانە هاوسەرگیری لەگەڵ کەسی باش، تەقوادار و ڕاستگۆ ماندوبوون و قوربانیدانی دەوێت، بۆ ئەوەی بەدەستی بهێنیت و لەگەڵی بژییت بەتایبەت بۆ کەسی ئیماندار و بە ئەخلاق بۆ ئەوەی بەدەستی بهێنیت پێویستت بە قوربانیدانە، بۆیە خوشکی سەنگینم، بۆ گەنجی باش و دیندار دەبێ لە ماڵەوە هەڵوێستت هەبێ، چونکە تاکە کەسێک بۆ تۆ گرنگ بێت، تەنیا پیاوەکەتە کە ژیان لەگەڵیدا بەسەر دەبەی تاوەکوو مردن بەخۆشی، ناخۆشی، سەرما و گەرما، بەتایبەت ئەوەی لەخوداترس و تەقوادار بێت، بەخۆشی و بەختەوەری لەگەڵت دەمێنێتەوە. کە وا بوو، با گوێڕایەڵی فەرمانی خودای گەورە بین و با بگەڕێینەوە بۆ بەرنامەی ئیسلام و پێیەوە پێبەند بین، بۆ هەر کار و ئاواتێک تەنیا پشت بە خودای گەورە ببەستین.

# خوشکم، کە گەنجیت تێپەڕی، پەشیمانی سوودی نییە

هاوسەرگیری، سوننەتێکی پیرۆزە لە گشت ئاینێکدا هەیە و، لە دین و بەرنامەی ئیسلامیشدا گرنگی زۆری پێ دراوە، چونکە ئەم سوننەتە قەڵغانە و موسڵمان دەپارێزێت لە تاوانی گەورە و ناڕەوا، پاشان نیوەی ئیمانی تەواو دەبێت، واتە: ئەگەر کوڕ و کچێکی گەنج هاوسەرگیرییان ئەنجام نەدابوو، بەڵام پێبەند بوون بە دین و بەرنامەی ئیسلام دوای ئەوەی هاوسەرگیرییان کرد، مانای وایە ئیمانەکەیان تەواو بووە و، چاویان تەنیا لەسەر یەکتر دەبێت، چونکە نەفسی مرۆڤ هەمیشە هاندەری خراپە و تاوانە، وای لێ دەکات سەیری نامەحرەم بکات، تووشی تاوانی بکات.

بۆیە ژنهێنان دەبێتە بەربەست و قەڵغان بۆ دوورکەوتنەوەی موسڵمان لە خراپە و، وا دەکات چاوی تەنیا لەسەر هاوسەری خۆی بێت، بەڵام لەم سە ردەمەدا چەندان هۆکار و بەربەست لەبەردەم بەیەکگەیشتنی کوڕ و کچەکانمان دان و، بەمەش تەمەنی گەنجێتییان بەرەو پیری دەڕوات، لە کاتێکدا هاوسەرگیرییان نەکردووە، گەنجی وا هەیە تەمەنی (٣٥-٤٥) ساڵە، کەچی هێشتا هاوسەرگیریی نەکردووە.

چونکە کاتێک هاتوونەتە پێشەوە بۆ داخوازی چەندان هۆکار و کێشە هاتوونەتە بەردەمیان، بوونەتە ڕێگر لەبەردەم شووکردنی ئەمەش وای کردووە هەر بە کچی بمێنێتەوە، لە کاتێکدا پیر بووە و سەری سپی بووە.

ئەوەی لەم نێوەندەدا زیاتر زەرەر و زیانی پێ دەگات، تەنیا خوشکانی ڕێزدارن، چونکە زۆربەیان بێکەس و غەریب دەمێننەوە، کەسێک نیە دڵییان خۆش بکات هەمیشە فکر و خەیاڵی خراپ مێشکیانی داگیر کردووە!

چونکە شوویان نەکردووە و تەمەنیان بەسەر چووە بەرەو پیری هەنگاو دەنێن و، دڵیان بە خۆیان دەسوتێ، لەبەرانبەریشدا لەلایەن ناسیار و خزمەکانی و دەوروبەری ڕووبەڕووی چەندان وتە و قسەی ناخۆش دەبنەوە، ها بۆچی شووت نەکردووە؟! ها پیر بوویت و، داواکارت نەهات! یان هاوڕێیەکانت هەموو شوویان کرد، تەنیا تۆ ماویتەوە، کەس پێت ڕازی نابێ!

لە کاتێکدا هۆکاری شوونەکردنیان، یان خۆیانن، یان باوک و برا، یان خزم و کەسوکار، یان هەر هۆکارێکی تر کە پرۆسەی هاوسەرگیرییان پەک دەخات.

هۆکارێکی تر ئەوەیە، کچەکە پیاوی خوشکەکەی یان پیاوی خزمەکەی زۆر خراپە بۆ ژنەکەی، زۆر بیستوویەتی لەوانەی پیاویان خراپە، کە پێیان گوتووە، کچێ شوو نەکەی خۆزگەمان بە تۆ کە بێ پیاویت، بۆیە ترساوە لە شووکردن، بە هۆی زۆری ستەمی پیاوەکان، شووکردنی لەپێش‌چاو کەوتووە، بەمەش داواکاری هاتووە، بەڵام ڕازی نەبووە. یان کچی وا هەیە کە دەزانێ گەورە بووە زۆر عیناد و بەفیزە، خۆی زۆر پێ جوانە بە خۆی دەنازێت و، دەڵێت: گفت و بەڵێن بێت شوو نەکەم، تاوەکوو بڕوانامە بەدەست نەهێنم، یان کوڕە گەنجێکی چاو شینی قۆز نەبێت، یان دەوڵەمەند و خاوەن پارە و سوڵتە نەبێت، یان باڵای بەرز نەبێت، یان فلانە عەشیرەتنە بێت، یان زۆر ئاوات و مەبەستی تر، بەمەش کچەکە داواکاری زۆری هاتووە، بەڵام ئەو مەرجانەی

نەبوە کە خۆی ویستوویەتی، لەبەر ئەوە داوای گەنجەکەی ڕەت کردووەتەوە بۆ شوکردن و، پرۆسەی هاوسەرگیری دوا دەخات.

یان چاوەڕێی ئەو کەسە بووە کە لە مەرجەکانیدا هەیە، کەسی تر زۆر هاتوون بۆ داخوازیی، بەس مەرجەکانی ئەوی تێدا نەبووە، بۆیە هەر وەستاوە لە چاوەڕوانی، تا پیر بووە و نەگەیشتووە بەو کەسەی کە دەیەوێت و ئەوانی تریشی لەدەست داوە! یان هۆکارێکی تری شوونەکردنی، ماڵەوەیان ڕێگر بوونە، گەنجی دیندار و ڕەوشتبەرزی موسڵمان هاتووەتە داوای، کەچی باوک و برای ڕازی نەبوونە، چونکە لە بنەماڵەی تر بوونە، بۆیە پێی ڕازی نەبوونە، نەیان هێشتووە کچیان شوو بکات بەو کەسە.

یان هۆکاری تر هەن، کە دایک و باوک بە کچیان گوتووە تۆ شایەنی کوڕی قۆز و کەشخە و جوانی، دەبێت هاوسەرگیری لەگەڵ کوڕێکی وەک خۆت بکەی، بەو جۆرە کچیان هێشتووەتەوە، داواشی هاتووە بەڵام نەیانداوەتێ، بۆیە بەم شێوەیە کچەکەیان هێشتووەتەوە، تا پیریان کرد و قەیرە بوو .

ئینجا ئەو کچانەی ماونەتەوە، هەموویان پەشیمان دەبنەوە، چونکە گەنجانی ئەم سەردەمە ئەقڵیان لە چاویانە تەمەن دەکەنە پێوەر بۆ ژنهێنان، شەرمیان بە خۆیانە کچ لە خۆیان گەورەتر بێت.

ئینجا گەنجەکان پێی ڕازی نابن، چونکە کچەکە تەمەنی لەوان گەورەترە، بۆیە کەس پێیان ڕازی نابێت، مەگەر ئەو پیاوانەی ژنەکانیان مردووە منداڵیان هەیە دەیانەوێ ژنی تر بهێنن، تاوەکوو منداڵەکانی بەخێو بکات، یاخود پیاوانی تر دەچنە داوای کە ژنیان هەیە دەیانەوێ بیکەنە دووان و سیان و زیاتر...

بۆیە سەرەتا خوشكان كە داخوازیيان دێت، كە زانییان گەنجی دیندار و لە خوداترسە با ڕازی بن، ئەگەرچی گەنجەكە هەژاریش بوو، بێ ناوبانگ بوو، بێ پلەو پۆست بوو، تەنیا دڵێكی پڕ لە تەقوا و دینداری هەبوو، با ڕازی بێت و، قەلەق و دڵەڕاوكێ نەبێت؛ چونكە دواتر خۆی پەشیمان دەبێتەوە. ئەی خوشكی من، سوێند بە خودا كچانێك هەن، ماونەتەوە و تەمەنیان زۆر گەورە بووە شوویان نەكردووە، دڵیان بە خۆیان دەسوتێ، هاوڕێكانیان هەموو شوویان كردووە، سێ چوار منداڵیان هەیە، بۆیە لە بێزاری و دڵتەنگییان بەڵێن بە ماڵەوەیان دەدەن، ئەگەر ئەم جارە داخوازییان بێت، ئەگەر كابرا چاوێكی كوێریش بێ، كەچەڵیش بێ، دەستێكی پێوە نەبێ، ژنی مردبێ و دە منداڵی هەبێ، هەر شووی پێ دەكات!

لە كاتێكدا كە گەنج بوو گاڵتەی بەم مەرجانە دەكرد و پێی عەیبە بوون، ئێستاش پەشیمان بووەتەوە، ئینجا كە لە كۆتاییدا داوای هات، كابرایەكە نەفام و نەزانە بەدین و ئیسلام، كچەكە لە داخی دەوروبەری بەناچاری بە داوایەكەی ڕازی دەبێت.

ئینجا پیاوەكە بەخراپی لەگەڵی دەجوڵێتەوە، كچە زۆر پەشیمان دەبێت هانا بۆشتی خراپ دەبات و، هەوڵ دەدات خۆی لەناو ببات، دەڵێت: خۆزگە هەر شووم نەكردبا، نەك ئەو ژیانە دۆزەخەم هەبا!

یاخود پیاوەكە زۆر گەورەترە لەو چونكە ژنی مردووە بۆیە ئەوی هێناوە، هاوڕێ و ناسیاوی كچە گاڵتەی پێ دەكەن، دەڵێن: پیاوەكەت پیرە سەری سپی بووە، حەیف شووت پێ كردووە، ئەم هەڵوێستەیش وای لێ دەكات تووشی خەمۆكی و دڵەڕاوكێ ببێت و، لە ژیانی بەختەوەر و دڵخۆش نەبێت.

بۆیە ئامۆژگاریمان بۆ خوشکانی ئیماندار کە هێشتا لە تافی لاویدان، دەبێ تاکە ئاواتیان ئەوە بێت لە دونیا هەموو ژیانی بۆ ئەوە بێت خودای گەورە لێی ڕازی بێت، نابێت عاتیفی و ساویلکە بن و چاو لە کچانی دوور لە دین و دواکەوتووی مۆدێل و سفورەکان بکەن، چونکە ئەوان نەزان و بێئاگان لە قیامەت و مردن، بەدوای دونیا و خۆشییەکانی کەوتوونە دەیان جار تەڵاق بدرێن گوێیان لێ نییە و گاڵتەیان پێ دێت، بێ دایک و باوکن بە ئارەزووی خۆیان دەگەڕێن و، هەرچی شەیتان حەزی لێ بێت دەیکەن و خۆیان دەفرۆشن بۆ پارە و خۆشی و ڕابواردنی نەفسی ناپوختیان، چاو لە کەسە فاشیل و دۆڕاوەکان دەکەن و، گۆرانیبێژ و ئەکتەری سینەماو فیلمیان کردووەتە پێشەنگ و مامۆستایان، بۆیە لە پاشەڕۆژدا زەرەر دەکەن و پەشیمان دەبنەوە ، بەڵام ئەو کات پەشیمانییش دادیان نادات!

ئەی خوشکم، ئەگەر ویستتان هاوسەرگیری بکەن، گەنجی دیندار و خوداویست هەڵبژێرن، پێش مەرجی جوانی، دەوڵەمەندی، ناوبانگ و پلەو پایە، قەوم و عەشیرەت، پێش هەموو ئەم مەرجانە با مەرج و داواکەتان تەنیا دین و ئەخلاق و ڕەوشت بێت، سوێند بە خودا سەربەرز و بەختەوەری دونیا و قیامەت دەبی،

چونکە وەسیەتەکەی خۆشەویستی خودا "پێغەمبەری ئازیز ﷺ" بۆ گشت کوڕ و کچێکی موسڵمانە کە ئیمان و ڕەوشت پێش هەموو مەرجەکان بخەن.

بۆیە ئەی ئیمانداران (برا و خوشکانی خۆم)، با بەملکەچییەوە بگەڕێینەوە بۆ لای خودا، بۆ لای بەرنامەکەی کە ئیسلامە، سارێژکەری گشت دەرد و کێشەکانە.

ئەو کێشە و دەردانەی مرۆڤەکان پێیەوە دەناڵێنن، یەکتری لەسەر بەکوشتن دەدەن؛ ئەگەر بزانین چارەسەر لای بەرنامەی خودایە، هەموو بەڕاکردن بۆ لای ئەو دەگەڕاینەوە، بەڵام بە داخەوە جاهیل و نەزانین بە دینەکەمان، تەنیا خەریکی دونیا و ڕابواردن و خۆشیین لەپێناو کەمێک خۆشیی نەفسمان، قیامەتمان لەیاد کردووە.

ئەی خوشکی ئیماندارم، گەنجی ساویلکە و خۆشباوەڕ مەبە، بەوەی خۆت هەڵبخەڵەتێنی کە کوڕ زۆرن مێردیان پێ بکەیت، دڵنیابە لە ئێستادا لەم سەردەمەی دونیاپەرستی و زۆری کێشەکان کەسی تەقوادار و ئیمانداری ڕاستگۆ زۆر کەمن، زۆربەی خەڵکی دوای دونیا و خۆشییەکانی کەوتوونە، نەکەی لە ژیانت کەسی ئیماندار ڕەت بکەیتەوە و پێی ڕازی نەبیت، چونکە ئەوانە پەروەردەی قورئان و مزگەوتن؛ سوێند بە خودا باشترین ژیانت بۆ دەستەبەر دەکەن، چونکە لەخودا دەترسن لە حەقیقەتی دین و دونیا تێگەیشتوونە، دەزانن ئەم ژیانە کاتییە و مانەوەی تا سەر نییە.

بۆیە هەردەم هەوڵی ئەنجامدانی کاری چاکە و چاکەخوازی دەدەن، دڵ بەبەزەیین و، پەروەردەی ئیسلام و قوتابیی پێغەمبەری خودان ﴿ﷺ﴾ بۆیە زوڵم و غەدرت لێ ناکات.

بەڵام ئەگەر هاتوو دوور لە دین و ئیسلام بوو ڕازی مەبن، چونکە لەخودا ناترسێ بۆ خۆشیی نەفسی خۆی ئیهمالت دەکات و غەدرت لێ دەکات و ناپاکیت لەگەڵدا دەکات، لەپێناو تێرکردنی نەفسی.

بۆیە هەتا گەنجی مەرجەکانت قورس مەکە، تاوەکو تەمەنیشت تێنەپەڕیوە، لە داهاتووش بەخەم و ئازار ژیانت وێران مەکە، بە گەنجی دیندار و هەژار ڕازی بن بۆ ئەوەی هەر لە دونیا پاشان قیامەت بە خۆشی و بەختەوەی بژین.

ئەوە بزانە، کە ئێستا خوشکانێک هەن دڵیان پڕی خەم و ژانە بە هۆی ئەوەی شوویان نەکردووە و، لەلایەن دەوروبەرەکەیشی قسەی ناخۆشیان پێ دەوترێت.

ئەمەش نامەی خوشکێکە شووی نەکردووە تەمەنی گەورە بووە، دوای ئەوەی بابەتێکمان بڵاو کردەوە لە تۆڕی کۆمەڵایەتی دەربارەی "هۆکار و چارەسەری قەیرەیی (گەورە کچ) خوشکێ نامەی نارد و دەستخۆشی و دوعای خێری بۆ کردین و گوتی: "بابەتەکەت باسی منیشی تێدایە و منیش ئەو شتەم بەسەر هاتووە لە تەمەنی گەنجێتیمەوە. من، کچێکم، تەمەنم چل و دوو ساڵە، هەر لە تەمەنی هەژدە ساڵییەوە داواکارم هەبووە، کاتێک لەو تەمەنەدا بووم دوو سێ داواکارم هەبوون، ماڵەوە ڕازی نەبوون، ئەوانیش هۆکاریان هەبوو.

کە ڕازی نەبوون گلەییم لێیان نییە، بەڵام دوای ئەوە بڕیار کەوتە دەست خۆم هەر کەسێک دەهات بەدڵم نەبوو هەر چاوەڕێی جوانتر و باشترم دەکرد، زۆر گوێم لێی نەبوو، باکم بەشووکردن نەبوو گاڵتەم پێ دەهات، وام دەزانی هەر بەو شێوەیە بە گەنجی دەمێنمەوە ئەو کاتەش زۆر لە دین شارەزا نەبووم، نوێژم دەکرد و ڕۆژووم دەگرت، بەڵام ئەوە نەبوو ئێستا دەیزانم لە عەقیدە و تەوحید شارەزا بم، چونکە لەدینشارەزابوون وات لێ دەکات ژیان بە جۆرێکی تر ببینی، کەسێکی دیندار هەڵبژێری و ڕازی بی پێیان؛ من کچێکم، تاڕادەیەک جوان و خاوەن کەسایەتییەکی مامناوەند بووم،

پێم وا بوو پەکم ناکەوێت بە دڵی خۆم گەنجێکی جوانم بۆ دەبێت، دواکاریشم زۆر بوو، بۆ هەموو ئەوانەی داوایان دەکردم بیانوویەکم هەبوو، بۆ ئەوەی ڕازی نەبم شوویان پێی بکەم، ئەوەش نەبێت من کەسێکی تایبەت لە ژیانمدا هەبووبێت، بۆیە بەوان ڕازی نەبووم؛ نەخێر، هیچ کەس نەبوو، هەندی جار دەڵێم قەدەرم وا بوو بۆیە ڕازی نەدەبووم پێیان، هەندێ جاریش دەڵێم خۆم هۆکاری مانەوەمم، چونکە بەبێ هۆکار داواکارم ڕەت دەکردەوە، تا تەمەنم گەیشتە سی ساڵ بۆ سی و پێنج ساڵ گوێم لێی نەبوو، دوای ئەو تەمەنە کەوتمە خەمی خۆم، بەڵام بە داخەوە کات درەنگ بوو، ئەوانەی دەهاتنە داوام دوای ئەو تەمەنە یان ژنیان تەڵاق دابوو، یان ژنیان مردبوو منیش ترسم لەوە هەبوو نەتوانم لەگەڵیان سەرکەووتو بم، چونکە من کچ و ئەوان پیاوی بەتەمەن دەمگوت لەوانەیە لێک تێ نەگەین، بۆیە توانای بڕیاردانم نەبوو، بەڵام ئێستا کە تەمەنم بەرەو سەروتر چووە، ئەوانە داوام دەکەن، ئەو کەسانەن کە دەیانەوێ ژنی دووەم بهێنن، سەیرەکەشم لەوەدایە من ئیستا قەناعەتم بەوانەش هەیە شوویان پێی بکەم، بەڵام سەر ناگرێت، هەندێکی لەوانەی دەیانەوێ ژنی دووەم بهێنن منیان ناوێ، دەڵێن: 'تازە منداڵی نابێ!'

ئێستاش هەر دواکارم زۆرە ئەوە نەبێت کەس داوام نەکات، بەڵام وەک گوتم، ئەوانەن ژنیان مردووە یان ژنی تەڵاق داوە یان دەیکاتە دوو و سێ، بەڵام چونکە تەمەنەکەم بەسەر چووە ئاسان نییە.

کاتی خۆی هەندێ کوڕ هەبوو من بەشتێکی ڕازی نەبووم یان نەیبووە، هەژار بوو، کەچی دوای ئەوەی ژنی هێناوە ئەوەی من دەمویست تییێدا هەبێت یان هەیبێ بەدەستی هێناوە،

بۆیە لە کۆتاییدا تکا لەو کچانە دەکەم کە هێشتا گەنجن و شوویان نەکردووە، ئامۆژگاریم بۆیان بەتەمای ئەوە نەبن لە سەرەتاوە هەموو ئەو شتانەی دەیانەوێ بۆیان دەستەبەر بێ، هاوسەرگیری زۆر گەورەترە لە هەندێ شت، کە کوڕێک لە ئێستادا نەیتوانی بۆت دابین بکات، گرنگ ئەوەیە گەنج دین و ئەخلاقی هەبوو، ئەوەی تر جوانی و پارە و ماڵی دونیان، کاتین و، دێن و دەڕۆن و بە تێپەڕبوونی کات دەوڵەمەند دەبی و هەژاریش دەبی، ئەو قەناعەتەی لە کچێکدا هەیە کە تەمەنی گەورە بوو و شووی نەکردووە زۆر جیاوازترە لە کچێک کە جارێ گەنجە، جا بۆیە تا تەمەنت بەسەر نەچووە ئەو قەناعەتە لە خۆتدا دروست بکە، کە تەنیا دین و ئەخلاق هەموو شتێکە، چونکە دواتر پەشیمانی دادمان نادات. هیوام وایە سوودێکی هەبێت بۆ ئەو خوشکانەی کە جارێ تەمەنیان بەسەر نەچووە، چونکە دوایی پەشیمانی هیچ سوودی نابێت بۆیان."

ئەمە نامەی ئەو خوشکە بەڕێزە بوو، وەک خۆی لێرە هێنامەوە وەکوو نموونەیەك، ویستوویەتی خێرێکی دەست کەوێ،

لەوەی ئەو حاڵەتەی ئەو تێیدایە هیچ کچێکی تر بەسەری نەیەت، بۆیە دوای خوێندنەوەی بابەتەکەمان ئاوای پێ گوتین و داوای کرد بۆی بڵاوی بکەینەوە،

داواکارین لە خودای گەورە دەرگای ڕەحمەتی خۆی لەم خوشکە و سەرجەم ئیمانداران (برایان و خوشکان) بکاتەوە، کە دەیانەوێ دوور بن لە تاوان و بەحەڵالی بگەن بە هاوسەریان (ئامین).

# بۆ ئەو خوشكانەی شوویان نەكردووە و ماونەتەوە

زۆرێک لە خوشکان شووکردنیان دوا دەکەوێت بە هەر هۆکارێک بێت، ئێمەی ئیماندار دەبێ ئەوە بزانین، کە خودای گەورە دروستی کردووینە لەم ژیانەی دونیادا، تاوەکوو تاقیمان بکاتەوە بۆ دونیایەکەی تر کە قیامەتە، ﴿الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾[1]. واتە: هەر ئەو خۆی مردن و ژیانی بەدی هێناوە، تا تاقیتان بکاتەوە، کە کێتان کردەوەی چاکترە.

ئینجا ئەگەر لەم ژیانەی دونیادا و، لەو تاقیکردنەوە و ناخۆشییانەی دێتە رێمان شوکرانە و سپاسی خودای گەورەمان کرد لەسەری، ئەو کاتی خودای گەورە لەبەرانبەر ئارامگرتنمان لەسەر تاقیکردنەوەکان بەهەشت دەکاتە پاداشتمان، ﴿ وَجَزَاهُم بِمَا صَبَرُوا جَنَّةً وَحَرِيرًا ﴾[2] واتە: لە پاداشتی خۆگری و ئارامگریاندا بەهەشت و ئاوریشمی پێ دەخشین.

بۆیە خودای گەورە مرۆڤەکان بە زۆر شت تاقی دەکاتەوە لە دونیادا، هەیە (چاوی نابینایە، گوێی نابیستێ، لاشەی شەلەلە و ناتەواوە)، یان خودای گەورە تاقیی دەکاتەوە بەوەی هەر ژن نەهێنێت، یان شوو نەکات، یان منداڵی نەبێت، ئێمە هیی خودای گەورەین، چۆنی بیەوێ ئەوها ژیانمان بەڕێوە دەبات، ئێمە نازانین خێر لە چیدایە، لەوانەیە حەزمان لە زۆر شت بێ لەم ژیانەی دونیا، ژنی جوان، یا پیاوی بەناوبانگ و دەوڵەمەند، یا لە هەموو خەڵک

---

[1] - سورەتی الملك، ئایەتی (٢).

[2] - سورەتی الانسان، ئایەتی (١٢)

جوانتر بین، یان بەناوبانگتر بین، یان خاوەن بڕوانامە و هتد.، لە وانەیە بەدەستی نەهێنین، ﴿وَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ وَعَسَى أَنْ تُحِبُّوا شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَكُمْ﴾.[1] واتە: لەوانەیە شتێکتان لا ناخۆش بێت کەچی خێر لەوەدا بێت، هەروەها لەوانەیە شتێکتان پێ خۆش بێت، کەچی شەڕ لەوەدا بێت، بێگومان هەر خودا خۆی دەزانێت (خێر لە چیدایە)، ئێوە نایزانن.

بەڵێ، کەسی ئاوا هەیە زوو قسمەتی دەبێ شوو دەکات، بەڵام خودای گەورە تاقی دەکاتەوە بەوەی منداڵی نەبێت، یان منداڵێکی ناتەواویان پێ دەخشێت، یان ژیانێکی ناخۆشی دەبێ لەگەڵ پیاوەکەی و بەردەوام شەڕیان دەبێت، یان تا ماوەی چەند ساڵێک بەیەکەوە دەبن دوایی تەڵاق دەدرێت؛ ئێمەی مرۆڤ نازانین ژیانی داهاتوومان چۆن دەبێ، خۆش یان ناخۆش، نەبوونی یان هەبوونی، ﴿وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَدًا﴾[2]. واتە: هیچ کەس نازانێت سبەی چی بەسەر دێت و، چی دەست دەکەوێت.

بۆیە زۆر پێویستە لەسەر ئێمەی ئیماندار لە خۆشی و ناخۆشیدا سپاسی خودا بکەین و تەنیا بەندەی ئەو بین، تاوەکوو لە کاتی تەنگانە و خەفەت سەبر و ئارامی بڕژێنێ بەسەرماندا.

بۆیە کە ئێمە زانیمان بەندەی خودای گەورەین هیچ کات خەم ناخۆین بەوەی کەوا بەخت و قسمەتمان نییە لە ژیان، چونکە خودا ئاگادارە بەخەم و

---

[1] - سورەتی البقرة، ئایەتی (٢١٦).

[2] - سورەتی لقمان، ئایەتی (٣٤).

خەفەت، خۆشی و ناخۆشی و ترپەی دڵمان ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي أَنْفُسِكُمْ﴾[1]. واتە: بزانن بێگومان خودا دەزانێت بەوەی کە لەدڵتاندایە.

بۆیە ڕەحمەتت لێ بێت هیچ کات بێهیوا مەبە لە ڕەحم و سۆزی خودای گەورە، لەوانەیە تاوەکوو ماوەیەک شوو نەکەیت خودای گەورە تاقیت بکاتەوە بۆ ئەوەی بەدیار بکەوێت ئەم بەندەیەم تاوەکوو چەند سپاسم دەکات و، خۆڕاگرە لەسەر ناخۆشییەکان، دڵنیا بە هەر ناخۆشییەک کە بەسەر موسڵماندا دێ لەژیانی دونیا لە خەم و ناخۆشی و ئازار بە ئارامگرتن لەسەری دەبێتە هۆکارێک بۆ سڕینەوەی تاوانەکان.

﴿ مَا يُصِيبُ الْمُسْلِمَ مِنْ نَصَبٍ وَلَ اوَصَبٍ وَلَا هَمٍّ وَلَا حُزْنٍ وَلَاأَذًى وَلَا غَمٍّ حَتَّى الشَّوْكَةِ يُشَاكُهَا إِلَّا كَفَّرَ اللَّهُ بِهَا مِنْ خَطَايَاهُ﴾[2]. واتە: پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ دەفەرمووێت: هەر شتێک تووشی موسڵمان ببێت لە خەم، خەفەت، ئازار، ناخۆشی، دڵتەنگی و نارەحەتی ئیلا خودا لە تاوانەکانی دەسڕێتەوە بە سەبرگرتن لەسەری، ئەگەر دڕکێکیش بێت تاوانت کەم دەکاتەوە بە ئارامگرتن.

بۆیە سەبرگرتن لەسەر دواکەوتنی هاوسەرگیری و خۆڕاگری لە نزیکبوونەوەی تاوان باشترین پاداشتی هەیە لای خودای گەورە.

پێویستە هەموو کات بەزەیی و میهرەبانی خودای گەورەت لەبیر بێت، دڵنیا بە خودا باشتری دەوێت لە خۆت بۆ خۆت، چونکە خودای گەورە زۆر بەبەزەیی و

---

[1] - سورەتی البقرة، ئایەتی (٢٣٥).

[2] - {متفق علیة}

میهرەبانە بۆ ئەوانەی کە باوەڕداری ڕاستەقینەن، ﴿وَكَانَ بِالْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا﴾[1].
واتە: جا ئەو پەروەردگارە هەمیشە و بەردەوام بۆ ئیمانداران بەبەزەیی و میهرەبانە.

ئەگەر بەندەیەکی ڕاستگۆ و دڵسۆز بی لە جێبەجێکردنی فەرمان و نەهییەکانی خودا، دڵنیا بە خودا ئاواتەکانت دێنێتە دێ، ئەگەر ڕۆژێک لە تەمەنت مابێ، بۆ خودا بژیی و خۆت ڕادەستی بکە و سپاسگوزار بە لەسەر ناخۆشی و دڵتەنگییەکانی دونیا لەوەی دێتە ڕێگەت لە خۆشی و ناخۆشییەکانی تاوەکوو سەرکەوتوو بی لە دونیا و دوارۆژدا.

بۆیە دەبێ موسڵمان ئەوە بزانێت کاروباری هەرچی بونەوەرە لە دونیا، مرۆڤ و جن، ئاژەڵ و ڕۆحلەبەران، دار و بەرد، گیاندار و بێگیان، هەرچی شتێک بوونی هەیە لەسەر زەوی و لە ئاسمان، هەمووی لە ژێر فەرمانی خودای گەورەدانە و بۆ چاوتروکانێک و ساتێکی کەمیش خودا لێیان بێئاگا نییە و ئاگاداری ترپەی دڵیانە.

﴿ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا ﴾[2]. واتە: هیچ گەڵادارێکیش بێ ئاگاداری و فەرمانی ئەو ناوەرێت.

ژیانی دونیای دروست کردووە بۆ مرۆڤەکان، هەموو شتێکی بۆ فەراهەم کردوونە تا بەخۆشی ژیان ببەنە سەر لە دونیا، ئەم ژیانە خۆشی و ناخۆشییەکانی هەتا سەر نییە و، بەڵکوو کاتین، جا مرۆڤ تاقی دەکرێتەوە بە گشت خۆشی و ناخۆشییەك، ئیماندار دەبێ خۆڕاگر و ئارامگر بێت لەسەر

---

[1] - سورەتی الأحزاب، ئایەتی (٤٣).

[2] - سورەتی الانعام، ئایەتی (٥٩).

گشــت تاقیکردنــەوەکان، ئــەگەر وای کــرد ئەوە ســەربەرزی دونیــا و قیامــەت دەبێت.

هاوسەرگیری لە ئیسلامیدا گرنگی زۆری پێ دراوە، ئەم سوننەتە پەرژینە و موسڵمان دەپارێزێت لە تاوان، کە بە جۆرێک تەنیا چاویان لەسەر یەکتر بێ و دوور بن لە حەرام.

بۆیە چوونە ژیانی هاوسەرێتی دەبێتە بەربەست بۆ دوورکەوتنەوەی کوڕ و کچان لەخراپە و، وا دەکات چاوی تەنیا لەسەر هاوسەری خۆی بێت، بەڵام لەم ڕۆژگارەدا چەندان هۆکار لەبەردەم بەیەکگەیشتنی کوڕ و کچەکانماندان و، بەمەش تەمەنی گەنجێتییان بەرەو پیری دەڕوات لە کاتێکدا ژنی نییە و شووی نەکردووە.

ئەوەی دەبێتە قوربانیش تەنیا کچەکانن، کوڕەکان بە هەموو شێوەیەک ڕادەبوێرن و هەموو شتێک دەکەن بۆ خۆشیی نەفسی خۆیان کەس باسیان ناکات، بەئازادی دەتوانن بچن کچ هەڵگرن و بیانبەن بۆ خۆیان، کوڕ هەبووە حەزی لە کچێک بووە دایک و باوکی ڕێگر بوونە، بەڵام کوڕەکە بەبێ منەتی کچەکەی هەڵگرتووە، بەدوای کەوتووە، بۆیە کچ وا نییە ناتوانێ وەکوو کوڕ بکات تووشی کوشتن و غەدر دەبێتەوە، بۆیە کچ ئەگەر ئاقڵ و ژیر بوو گەنجی دیندار هاتە داوای مەرجەکانی قورس ناکات و پێی ڕازی دەبێت.

بۆیە ئێستاکە لەم سەردەمەی پڕ کێشە و نەبوونی ئیش و کار و قەیرانی دارایی، قەیرانی کوڕی دیندار و بە ئیمانیشە تاوەکوو کچ شوویان پێ بکات، کوڕی ڕاستگۆ و ئیمانداری ڕاستەقینە ئەوەندە کەمن، زۆربەی کەوتوونەتە

دوای دونیا و ڕابواردنەکانی. بۆیە زۆربەی کچان شوویان نەکردووە و، هیچ ماڵێک نییە کچێکی نەبێ کە مابێتەوە نەچووبێتە ژیانی هاوسەرێتی.

بۆ چارەسەریی قەیرەیی و بێوەژنی و نەمانی کێشەکان دەبێ بگەڕێینەوە بۆ لای یاساو حوکم و بڕیاری خودای گەورە.

بەڵێ، ئیسلام چارەسەرە بۆ گشت کێشەکانی کۆمەڵگە، بۆ نەمانی قەیرەیی و ئەو کچانەی تەمەنیان گەورە بووە ماونەتەوە و یان بێوەژن بوونە، بۆ ئەم کێشەیە ئیسلام ڕێگەی داوە پیاو تا چوار ژن بێنێ، بە مەرجێک پیاو لەنێوانیان دادپەروەر بێت، ئەگەر نەیتوانی داپەروەر بێ لەگەڵیان بجوڵێتەوە، تەنیا یەک ژنی بۆ هەیە بیهێنێت. ﴿مَثْنَى وَثُلاثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ذَلِك أَدْنَى أَلَّا تَعُولُوا﴾[١]. واتە: دەتوانن ژنی تر مارە بکەن، دوان بن یان سیان پێکەوە یا چواریش بن هەر ڕەوایە، ئەگەر ترسان کە نەتوانن ژنەکانتان وەکوو یەک تەماشا بکەن، با یەکێک بێ یان لەگەڵ ئەوانە بژین کە بوونەتە موڵکی خۆتان، بۆ خۆ لە غەدر پاراستن ئەمە کارێکی پەسەندە.

یاسا و پرۆگرامی پاکی ئیسلام، کە بەرنامەی خودای گەورەیە فرەژنی ڕیگە پێ داوە، بێگومان هەمووی لە بەرژەوەندیی ئافرەت ئەو کارەی کردووە پێش بەرژەوەندیی پیاوان، بۆ ئەوەی سەرپەرشتێک بۆ کچانی هەتیو و بێوەژنی بێسەرپەرشت و کچانی قەیرە بدۆزێتەوە و، ژیانێکی شەرەفمەندانە و خۆشگوزەرانییان بۆ دابین بکات و لە ماڵی نوێی پیاوەکانیاندا بن، لەبریی

---

[١] - سورەتی النساء، ئایەتی (٣).

ئەوەی کە سەربار و گرفت و قورسایی بن بەسەر باوك، برا، کوڕ و کەسانی تریشەوە.

بەڵێ، ئیسلام ڕێگەی داوە پیاو لە یەک ژن زیاتر بێنێ تاوەکوو چوار، ئەمەش بۆ ئەوەی چارەسەری گەورە کچی و بێوەژن و ئەو ژنانەی جیابوونەتەوە و پیاویان مردووە بکات، تاوەکوو ڕێگر بێت لە بڵاوبوونەوەی فاحیشە، داوێنپیسی، خیانەت و ناپاکی.

﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴾[1]. واتە: ئاخر بۆ بیر ناكەنەوە كێ هەیە بەقەدەر خودا حوكم و بەرنامەی جوان و دادپەروەر و چاک و بەجێ بێت، بەتایبەت لای ئەو کەسانەی کە بەوردی سەرنج دەدەن و ویژدان و هەستی زیندوویان هەیە.

بۆیە خودای گەورە بە بێ حیمکەت تا چوارژنی ڕێ بە پیاو نەداوە، چونکە هەر ڕەگەزی پیاوە کە لە دونیادا زۆرینەیە کە ڕووبەڕووی کارەسات و کوشتن و نارەحەتییەکان دەبنەوە، بۆیە هەردەم پێشبینی ئەوە دەکرێت کە ڕێژەی مردن لای پیاوان زۆرتر بێت لە ڕیژەی مردنی ژنان، بەپێی ئامارەکان ڕێژەی ژنان زۆر زیاترە لە ڕێژەی پیاوان، بەتایبەت لەو کاتانەدا کە پیاوان دووچاری جەنگ و کوشتار و شەڕەکان دەبنەوە، هەربۆیە دەبینین لە وڵاتێکی وەک ئەڵمانیادا پاش جەنگی یەکەمی جیهانی ئافرەتان خۆپیشاندانیان کرد و داوای یاسای فرەژنییان دەکرد بۆ وڵاتەکەیان.

---

[1]- سوورەتی المائدة، ئایەتی (٥٠).

بۆیە جگە لە کێشەی کچانی قەیرە کێشەی ئافرەتی تەڵاقدراو و بێوەژنەکانیشی دێتە سەر، کە وا بوو، چ هەوڵێک ئەم کەلێنە پڕ دەکاتەوە ئەگەر فرەژنی نەبێت؟

هەربۆیە سەرژمێری بە ناو ڕێکخراوەکان وایان دەرخستووە کەوا ژمارەی ئافرەتان لە هەموو دونیا هەمیشە لە پیاوان زۆرترن، ئەگەر هەر پیاوێک ژنێک بێنێت، ئەی ئەو هەموو ئافرەتانە کە دەمێننەوە، چی بکەن و بۆ کوێ بچن؟!

بێگومان خراپە و زیانێکی زۆر لە کۆمەڵگە دەدات، کێشە و ئاژاوەیەکی زۆر لەسەر شەڕەف و ناموس سەر هەڵدەدا، ئافرەتەکە کە بێپیاوە هەست دەکات کە بێکەسە، چونکە کەسێک نییە خەمی بخوا و بژێوی و جێگە و شوێنی بۆ دابین بکات، وەکوو هاوڕێکانی و دەوروبەری کە پیاو وماڵی خۆیان هەیە و حەزو و ئارەزووی نەفسی بۆ دەستەبەر کات، کە ئەویش وەک ئەوانەی هاوسەرگیرییان کردووە بە ماڵ و منداڵی خۆی چاوی گەش بێ و دڵی خۆش بکات، بۆیە ئەگەر وا نەبێ، بیر بکەوە کە ئەم ئافرەتە بێمێرد و بێنازە؛ کە دەبینێت کەسێ نییە نازی بکێشێت، کەسێ نییە بژێوی بۆ پەیدا بکات و ئێوارە بێتەوە بە دەستی پڕ لە خواردن، کەسێ نییە گڕی حەز و نەفسی پێ ئاوا بکات، کەسێ نییە منداڵێکی چاوگەشی بۆ بێنێتە دونیاوە، کەسێک نییە دڵی ڕاگرێ و جێگەیەکی بۆ پەیدا بکات و پیاسە و سەفەرێکی لەگەڵ بکات، بەدڵنیاییەوە هەزار و یەک خەیاڵی لادەر و خراپ یەخەی پێ دەگرێت، ناچار دەبێت بە هەر هۆیەک بێت ئەم کەموکورتییەی خۆی پڕ بکاتەوە، ئەگەرچی لە سەر حیسابی فرۆشتنی شەڕەف و ناموسی خۆیشی بێت!

بۆیە ئیسلام ڕێگەی داوە پیاو بە ڕێگەی شەرعی ژنی تر بێنێت، نەک ئافرەت بە ڕێگەی حەرام کەسی تر پێی ڕابوێرێت و ببێتە یاریی دەستی ناپیاوەکان و تووشی تاوانی گەورەی بکات ئابڕو و ناموسی ئەتک بکات!

بەڵێ، ئەوانەی دژی فرەژنین و ڕێگە نادەن، پیاو تاوەکوو چوار ژن بهێنن، دەیانەوێت بێڕەوشتی و بێئەخلاقی لە کۆمەڵگە بڵاو ببێتەوە، ئەو کەسانە هەردەم خەونیان بە ڕووتی و بەڕەڵایی ئافرەتەوە بینیوە، تا بێپەردە و بە ئاشکرا گڕی نەفس و شەهوەتیان وەک ئاژەڵ لێ بەتاڵ بکەن، دەیانەوێ خەڵک وەک ئاژەڵ بژین و کەس لە حەیا و ناموسی خۆی نەپێچێتەوە، چونکە بە ڕێگەنەدان بە فرەژنی، ڕێژەی تاوان و داوێنپیسی زۆر دەبێت، ئافرەتانێکیش بێڕەوشت بکەن و هەر ڕۆژە یان هەر شەوە کام پیاوەیان پێ خۆشە لە باوەشیاندا ڕابوێرێ و بەزمی شەوێیان خۆش بکەن و هتد..

بۆیە ئەی خوشکی ژیرم، بگەڕێەوە بۆ ئیسلام و ڕازی بە بە فرەژنی بەوەی سەر بە هەوێ شوو بکەیت زۆر باشترە لەوەی بە پیری بمێنیتەوە یان ببیتە یاریی دەستی پیاوی خراپ و بە ئارەزوەی خۆی یاری بە هەست و ناموست بکات، بۆیە باشترە سەر بە هەوێ شوو بکەی لای پیاوێکی دیندار تاوەکوو لە دونیا و قیامەت بەختەوەر و سەرکەوتو بیت، چونکە بە ڕازینەبوونت بەوەی سەر بە هەوێ شوو بکەی، تەنیا خەم و ئازارە بۆ خۆت بە مانەوەت بە قەیرەیی و پیربوونت بە بێ هاوسەر. سوێند بە خودا ئەو ئیماندارەی بەڕاستی لە خوداترسە، ئەگەر ژنیشی هەبوو داخوازییان کرد لێت، ئەوە ڕازی بە و پێت شەرم و عەیبە نەبێ کە سەر بە هەوێ شوو بکەی، بەڵام گەر هاتوو دوور لە

دین و ئیسلام بوو، ڕازی مەبە، چونکە لەخودا ناترسێ بۆ خۆشیی نەفسی خۆی ئیهمالت دەکات و غەدرت لێ دەکات و ناپاکیت لەگەڵ دەکات.

بەس ئەوانەی پەروەردی قورئان و مزگەوتن سوێند بە خودا باشترین ژیانت بۆ دەستەبەر دەکەن، چونکە لە حەقیقەتی دین و دونیا تێ گەیشتوونە،

دەزانن ئەم ژیانە کاتییە و مانەوەی تا سەر نییە. بۆیە هەموو کات هەوڵی ئەنجامدانی کاری چاکە و چاکەخوازی دەدەن، دڵیان بەبەزەیییە و پەروەردەی ئیسلام و قوتابیی پێغەمبەری ئازیزن ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ بۆیە زوڵم و غەدر ناکەن گەر چوار ژنیشیان هەبێ، بەیەکسانی و دادپەروەری دەجوڵێنەوە.

بە داخەوە زۆرێک لە کچان تەمەنیان زۆر بووە و هەر چاوەڕێی کوڕی گەنج و قۆز و بێژن بۆ ئەوەی شوویان پێ بکەن، کەچی تەنیا خۆیان هەڵدەخەڵتێنن، چونکە گەنجەکان ڕازی نین بە کچی بەتەمەنتر لە خۆیان بۆیە ڕازی نابن، تەنیا ئەو پیاوانە داوایان دەکەن کە ژنیان هەیە بەڵام کچەکە بە خۆی شەرمە سەر بەهەوێ شوو بکات، بۆیە هەر چاوەڕێ دەکات و هەر تەمەنی هەڵدەکشێ بەمەش خۆی دەکاتە قوربانی، بەوەی هەر بە کچی بمێنێتەوە و شوو نەکات.

پاشان خوا دەزانێ کێ شوو ناکات و ژن ناهێنێ، لەوانەیە الله تۆ بپارێزێ لە پیاوی خراپ بۆ ئەوەی تووشی ناخۆشی و تاقیکردنەوەی سەخت نەبیتەوە، چونکە ژیان لەگەڵ پیاوی خراپ واتە دۆزەخ، واتە مردن، واتە بە جەستە و لاشە زیندوو و بەدڵ و ناخ مردوییەکی خۆشی لەخۆ نەدیوو، بۆیە لەوانە شوو بکەی پیاوەکەت خراپ و زۆر زاڵم بێت نەتوانی بەرگەی بگریت لە خەفەتان خۆت لەناو ببەی یان خۆت بسووتێنی، بخنکێنی، زۆر کەس هەیە توانای

بەرگە گرتنی خەم و ناخۆشی نیە، بۆیە زوو خۆی دەکوژێ، بۆیە خوای گەورە چاکەی بەندەکانی دەوێت، هیچ کار و ئیشێ بێ حیکمەت نیە، بۆیە ئیماندار دەبێ بەردەوام شوکر بێت، ئامۆژگاریمان بۆ ئەو خوشکانەی تەمەنی گەنجیان بەسەر چووە با بەندەیەکی سوپاسگوزار و ئارامگربن، بیر لە رەحم و میهرەبانی خوای گەورە بکەنەوە، وە بزانن مانەوەیان لە دونیا کاتیە و تێدەپەڕێ بۆیە نەکەن دڵیان تەنگ و بێتاقەت بکەن و گەر پارە و داهاتیان هەبوو ئەوە هاوکاری هەژار و یەتیمەکان بن، هەرکات زانیان پرۆژە و بەرنامەیەك هەیە بۆ خزمەتی ئیسلام و موسڵمانان با هاوکاریان بکەن بەنیەتی ئەوەی ڕەزامەندی خوا و بەهەشت بەدەست بێنن، ئەو تەمەنەی ماویانە نەهێڵن ساتێکی کەمیش بۆ غەیری خوا بەزایە بڕوات، هەمیشە بەندەیەکی دڵسۆزی خوابن تا مردن نەگۆڕێن و کۆشش بکەن بۆ دواڕۆژیان، بۆ ئەوەی خوای گەورە قەرەبووی ناخۆشی و تاڵی ژیانی دونیایان بۆ بکاتەوە، بە خۆشی و ناز و نیعمەتی بەهەشتی پان بەرین.

کە وا بوو، ئەی کۆمەڵی خوشکانی ئیماندارم، با بگەڕێینەوە بۆ بەرنامەی ئیسلام و بە فەرمان و ڕێساکانی پێبەند بین، بۆ هەر کار و ئاواتێک تەنیا پشت بە خودای گەورە ببەستین و، بەملکەچی داوای هاوکاری و کۆمەکی تەنیا لەو بکەین، کە خاوەنی زەوی و ئاسمانە دڵنیا بن سەرفراز و سەرکەوتوو دەبین. بە ئیزنی خودای گەورە.

## بۆ بەختەوەربوون با پێغەمبەر ﷺ بکەین بە پێشەنگمان

ئێمە کە موسڵمانین و ئیسلام بەرنامەمانە، پێشەوا و مامۆستایەکمان هەیە، کە سەرقافڵە و سەرکردەی ئەو بەرنامە پاکەیە کە خودای گەورە کردوویەتی بە ڕێسا و یاسا بۆ مرۆڤایەتی، ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا﴾ [1] واتە: ئەمڕۆ ئاین و بەرنامەکەتانم بەکۆتایی گەیاند و ناز و نیعمەتی خۆمم بۆ تەواوکردن و ڕازیم بەوەی کە ئیسلام ببێتە بەرنامە و یاسا و ئاینتان.

بەڵێ، ئەم پێغەمبەرە ئازیزە ﷺ لە ماوەی بیست و سێ ساڵی پێغەمبەرایەتی، تەواوی جیهانی گۆڕی لە نەهامەتی، ناخۆشی، یەکترکوشتن، زوڵم، ستەم و خراپە، بۆ خۆشی و بەختەوەریی ژیان و هەستکردن بە مانای مرۆڤبوون. بەڵێ، خودای گەورە ئەم پێغەمبەرەی ﷺ بۆ کردین بە ڕووناکی تا خەڵکی ئاگادار بکاتەوە بە وازهێنان لە خراپە و ئازاردانی یەکتر و، لەو کردەوانەی سنووری خودا دەبەزێنن و ئاشنایان بکات بە یاسا و بەرنامەی ئیسلام و یەکخواپەرستیی خودای گەورە، کە تەنیا بەندەی خودا بین.

﴿وَدَاعِيًا إِلَى اللَّهِ بِإِذْنِهِ وَسِرَاجًا مُنِيرًا﴾[2]. واتە: هەروەها بانگەواز دەکەی بۆ لای خودا لەسەر مۆڵەتی ئەو، چرایەکی ڕووناکیشی بۆ سەرجەم سەرگەردانان.

---

[1] - سورەتی المائدة، ئایەتی (٣).

[2] - سورەتی الأحزاب، ئایەتی (٤٦).

لە مێژووی مرۆڤایەتی هیچ مرۆڤێک نە لەپێش خۆیەوە نە لەدوای خۆی وەک ئەو نەبووە و نابێ، لە هەموو ڕوویەکەوە سەر مەشقە هەر لەپێش ئەوەی خودای گەورە بیکات بە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾بە ڕاستگۆی دەستپاک ناسرابوو، لەنێو خەڵکی، واتە دەستپاکترین و ڕاستگۆترین کەس بوو، لە ڕووی ڕەوشت و ئەخلاقەوە، باشترین مرۆڤ بووە هەتا لەگەڵ منداڵ، پیر و گەورەکاندا، کاتێ بەلای منداڵاندا تێپەڕ دەبوو سڵاوی لێ دەکردن.

بەڕاستی مرۆڤ ناتوانێ بە وتە و نووسین باسی سیفەت و ئەخلاقبەرزی ئەم سەرکردەیە بکات، بۆیە هەرچی باس بکەین لەئاست ئەخلاق و گەورەیی ئەم پێشەوایە هەر کەمە، ئەمەش شاهێدی خودای گەورەیە بۆی، هەروەک جوانترین وەسفی دەکات و، دەفەرمووێت: ﴿وَ إِنَّک لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾[١]. واتە: بەڕاستی تۆ لەسەر ڕەوشت و ئەخلاقێکی ئێجگار بەرز و گەورەیت.

بەڵێ، ئەم ڕابەرە لە پێهەڵدانی کۆتایی ناهێت، مرۆڤێکە لە وەسف، سەنا و گەورەییدا کانیاوێکی سازگارە، هەڵدەقوڵێ و لەبەری دەڕوات هەتا دونیا ماوە کۆتایی پێ ناهێت.

ئەگەر بەیەکەوە بچینە خزمەتی تاوەکوو بۆمان دەرکەوێت، ئایا چۆن هەڵسوکەوتی لەگەڵ خێزانەکانی کردووە! لە کاتێکدا ئەرکی تەواوی ئوممەتی لەسەر شان بووە، وەکوو پەیامبەر و ڕێنیشاندەر بۆ خەڵکی نێردرابوو، ئایا ئەم ئەرکە قورسەی سەر شانی وای لێ کردبوو خێزانەکانی ئیهمال بکات و گرنگیان پێ نەدا! بێگومان نەخێر، بەڵکوو جوانترین ڕەوشتی بەرانبەریان پێڕەو دەکرد،

---

[١] - سورەتی القلم، ئایەتی (٤).

بۆ دەربڕینی خۆشەویستی ناوی "عائیشە"ی (ڕەزای خودای گەورەی لێ بێت) كورت دەكردەوە و، دەیفەرموو: "یا عائش" بە شێوەیەك ڕێزی دەگرتن كە بە ناوی باوكییەوە بانگی دەكرد و، دەیفەرموو: كچی صدیق؛ تەنانەت لەگەڵ شێت و كەمعەقڵەكان بە جوانترین شێوە مامەڵەی كردووە.

بۆیە ئێمەی موسڵمان ئەگەر بەختەوەری و خۆشیی دونیامان دەوێت و لە دواڕۆژیش ڕەزامەندیی خودا و بەهەشتی فیردەوس ئەوە دەبێ چاو لەم پێغەمبەرە ئازیزە ﴿ﷺ﴾ بكەین، چونكە ئەم پێغەمبەرە ﴿ﷺ﴾ پێشەنگ و سەرمەشقە لە هەموو ڕوویەكەوە هەر كەس گوێداری بێت و شوێن ڕێباز و ئامۆژگارییەكانی بكەوێت، ئیلا سەربەرز و سەرفراز دەبێت، ﴿ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴾[١]. واتە: هەر كەس گوێڕایەڵیی خودای گەورە پاشان پێغەمبەرەكەی بكات، ئەوە بەڕاستی سەركەوتنێكی گەورەی بەدەست هێناوە.

بەڵێ، ئیمانداری ڕاستەقینەش چاو لە ڕەوشت و هەڵسوكەوتی مامۆستاكەی دەكات كە "موحەممەد"ی هەڵبژاردووە ﴿ﷺ﴾، كە چۆن بووە بەرانبەر بە خەڵك و چۆن بووە لەگەڵ منداڵ و خێزان، بۆیە خوشكی بەڕێزم هیچ كات دوودڵ و قەلەق مەبە، لەو گەنجەی كە دێتە داوات، كە زانیت ئیماندارێكی ڕاستگۆ و شوێنكەوتەی پێغەمبەرە ﴿ﷺ﴾، ئەو كات بەبێ دوودڵی ڕازی بە و، پشت بە خودا ببەستە.

كە وایە هاوسەرانی ئیماندار تاوەكوو ژیانی دونیا و دواڕۆژیان بەختەوەری و دوور لە كێشە و ناخۆشی بێت، با چاو لە پێشەواكەیان بكەن كە چەندە ڕێزی

---

[١] - سورەتی الأحزاب، ئایەتی (٧١).

لە هاوسەرانی گرتووە و، خۆشی ویستوونە و بۆیان بەوەفا بووە، لەپاش مردنیشی خێزانە بەڕێزەكانی هەر لەبیریان نەكردووە.

ئەمە دایكی ئیماندااران خاتوو عائیشە (ڕەزای خودای گەورەی لێ بێت) دەگێڕێتەوە كە پیرەژنێک هاتە لای پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ و، پێی فەرمووو: تۆ كێی؟

گوتی: جثامەی موزنی.

پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: تۆ حەسانەی، ئێوە چۆنن؟

ئەحواڵتان چۆنە؟ پاش ئێمە ئێوە ئەحواڵتان چۆن بوو؟!

گوتی: دایک و باوكم قوربانت بن، باشین.

كاتێک ڕۆیشت، خاتوو عائیشە، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ئەوە چۆنە بەم جۆرە پێشوازییە پێشوازیت لەم پیرەژنە كرد؟

فەرمووی: لە سەردەمی خەدیجەدا (ڕەزای خودای گەورەی لێ بێت) هاموشۆی دەكردین.

باش بەجێهێنانی عەهد و پەیمان لە بڕواوەیە.[1]

هەروەها خاتوو عائیشە (ڕەزای خودای گەورەی لێ بێت) گوتویەتی: ﴿**ما غِرْتُ علَى أحَدٍ مِن نِسَاءِ النبيِّ ﴿ﷺ﴾ ما غِرْتُ على خَدِيجَةَ، وما رَأَيْتُهَا، ولَكِنْ كانَ النبيُّ ﴿ﷺ﴾ يُكْثِرُ ذِكْرَهَا، ورُبَّما ذَبَحَ الشَّاةَ ثُمَّ يُقَطِّعُهَا أعْضَاءً، ثُمَّ يَبْعَثُهَا في صَدَائِقِ خَدِيجَةَ، فَرُبَّما قُلتُ له: كَأنَّهُ لَمْ يَكُنْ في الدُّنْيَا امْرَأَةٌ إلَّا خَدِيجَةُ، فيَقولُ إنَّهَا كَانَتْ، وكَانَتْ، وكانَ لي منها ولَدٌ**﴾[2]

---

[1] - رواه الحاكم وصححه وو افقه الذهبی.

[2] - أخرجه البخاري (٣٨١٨)، ومسلم (٢٤٣٥).

واتە: غیرەم بەرانبەر هیچ خێزانێکی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾نەبووە بەقەد ئەوەندەی بەرانبەر بە خەدیجە هەمبووە کە هەرگیز نەم بینیوە!

بەڵام پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ زۆر باسی دەکرد کاتی مەڕی سەردەبڕی و لەتلەتی دەکرد بۆ هاوڕێکانی خەدیجەی دەنارد.

بە پێغەمبەرم ﴿ﷺ﴾ گوت: وەک بڵێی لە دونیا کەسی تێدا نەبووبێ، تەنیا خەدیجە نەبێت!

ئەویش فەرمووی: کە وا بێ، هەر ئاواشە، چونکە منداڵم لێی هەبووە!

هەر لەم بارەیەوە "دکتۆر نظمی لۆقای مەسیحی" لەسەر وەفای پێغەمبەری ئازیز﴿ﷺ﴾ لە ڕیسالەکەی، دەڵێ: ئەمە چ کردەوەیەکە وا لە پیاو دەکات دوای مردنی هاوسەرەکەی بە چەندان ساڵ بۆی بەوەفا بێت و، بەدڵنەرمی و بەبەزەیی و ستایشکردنەوە باسی دەکات. ئایا مرۆڤی بەویژدان ئەوە لەبیر دەکات کە لە جەنگی «بەدر»دا ڕووی دا، کە "عاص بن ربیع" مێردی زەینەبی کچی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بە دیل گیرا، کە ئەو کاتە لەسەر ئاینی باوکی بوو، بێبڕوا بوو، داوا لە "ابو العاص" کرا فیدیە بدات، جا زەینەبی خێزانی عاص هات، ملوانکەیەکی دایکی پێ بوو، هی خەدیجەی کچی خوەیلید، وەک بڵێی بۆ ئەوەی هێنابێ، تا چاکەی خەدیجەی بهێنێتەوە بەرچاو کە چەند لەسەر ئەوە شیوەنی بەرکەوتووە، چەند نیعمەتی حەسانەوەی پێ بەخشراوە لە ناخۆشییەکانی جیهاد و کولەمەرگی و بانگەوازی، کە تووشی توندی و زەحمەت و ناخۆشی دەبێت، جا پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ ئاوڕی دایەوە بەلای هاوەڵەکانی و دوای پرسکردنی و ڕەزامەندیی هاوەڵان ملوانکەکەی گەڕاندەوە

بۆ زەینەب و ئینجا مێردە دیلەکەی ئازاد کرد لەبەر ڕێزی ئەو بیرەوەرییە خۆشە.

"ابو العاص کوڕی ڕەبیع" کێیە؟ ئایا کوڕی خوشکی خەدیجە نەبوو؟ کە خەدیجە وەک کوڕی خۆی دایدەنا و بە مێردەکەی گوت: زەینەبی پێ بدات، پێش ئەوەی ببێت بە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەم وەفا گەورەیەی پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾بەرانبەر بە خەدیجە بەڵگەی جوامێری و خانەدانی و ڕەوشتبەرزییەتی و، ڕێزگرتنیەتی بۆ خەدیجە وێڕای گەورەیی تەمەنی لەچاو تەمەنی پیرۆزی پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ جا جوانی و شارەزاییی عائیشە هەموو ئەوانەی لەبیر نەبردەوە کە بەدرێژاییی تەمەنی بەوەفایی مایەوە، وێڕای بەتەمەنییشی ژنی بەسەر نەهێنا، تا ئەو کاتەی گیانی سپارد.[١]

دکتۆر نظمی لە هەمان کتێب و، لە لاپەڕە ٥٦دا، دەڵێ: پاش ئەم کێشەیە عائیشە نەیوێرا باسی خەدیجە بە زمانیدا بێت، لە کاتێکدا عائیشە ژنێکی گەنج و جحێل بووە.

کێ وەک موحەممەد ﴿ﷺ﴾ دەتوانێ ئەم کردەوەیە بنوێنێ، ئاوا بەم جۆرە وەفایە بەرانبەر خەدیجە بەوەفا بێت، جا حەق وایە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بکرێتە نموونەی پیاو (مێرد) و نموونەی پێ بهێنرێتەوە بە پیاو و ئافرەتەوە!

دەبینی ئەو ڕەفتارەی بۆ ئەو کەسە نواند، کە مردووە، ئەو کەسەش کە لەگەڵی دەژێ و خۆشی دەوێ، تورەی دەکات! سەبارەت بەم بەوەفاییە چ دەگوترێ، کە دونیا پڕە لە نموونەی دڵئازاردەر و سپڵەیی و ناپاکیکردنی پەیمان.

---

[١]- (محمد في حياته الخاصة)، لاپەڕە (٥٥-٥٤).

بۆیە هەموو پیاو و ئافرەتێک بەختەوەریيان دەوێت لە ژیانیاندا، با چاو لە پێغەمبەرە خەمخۆرەکەیان ﴿ﷺ﴾ بکەن.
هەوڵ بدەن شارەزای ژیانی پێغەمبەرەکەیان بن﴿ﷺ﴾ کە چۆن بە جوانترین شێوە ڕەفتاری کردووە بەرانبەر بە هاوسەرانی، کە چاومان لێ کرد ئەو کات سەرفراز و بەختەوەریی دونیا و دوارۆژ دەبین.
ئەمەش نموونەیەکی تر لە خۆشەویستی و ڕێز و وەفاو میهرەبانی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﴿ﷺ﴾ لە ماڵەوەی، کە چۆن هەڵسوکەوتی کردووە بەرانبەر خێزانە بەڕێزەکانی، خاتوو عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێت) دەفەرمووێت: **﴿كُنْتُ أَشْرَبُ وَ أَنَا حَائِضٌ، ثُمَّ أُنَاوِلُهُ النَّبِيَّ ﴿ﷺ﴾ فَيَضَعُ فَاهُ عَلَى مَوْضِعِ فِيَّ، فَيَشْرَبُ، وَ أَتَعَرَّقُ الْعَرْقَ وَ أَنَا حَائِضٌ، ثُمَّ أُنَاوِلُهُ النَّبِيَّ ﴿ﷺ﴾ فَيَضَعُ فَاهُ عَلَى مَوْضِعِ فِيَّ﴾**[1]
واتە: من لە حەیزدا بووم لە جامی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئاوم دەخواردەوە، جا پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ دەمی پیرۆزی خستە سەر ئەو شوێنەی کە دەمم پێوە نابوو، ئاوەکەی خواردەوە؛ هەروەها لە حەیزدا بوم، ئێسکە گۆشتم دەکرانەوە و، پاشان دەمدا بە پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ دەمی پیرۆزی دەخستە سەر ئەو شوێنەی کە کرانبوومەوە. (سبحان الله) ئەمەیە ڕێز و خۆشەویستیی نێوان هاوسەران، ئەگەر سەرنجی ئەم فەرموودەیە بدەین، خۆشەویستیی ژن و مێردی موسڵمان بەدەر دەخات، ئەویش گرنگیدان بە یەکتری و گەمە و یاریکردنە.

[1]- سەحیحی مسلم، ژمارەی فەرموودە (٣٠٠).

جا ئەو خۆشەویستییە لە کوێ و ئەوەی لەم سەردەمەی خۆشمان لە کوێ، کە هاوسەران زۆر سارد و بێزن بەرانبەر یەکتر، خیانەت و ناپاکی لە یەکتر دەکەن لەپێناو خۆشیی نەفسی خۆیان، گاڵتە بە یەکتر دەکەن لای خەڵکی و بە پیس و چڵکن ناوی یەکتر دەهێنن؛ زۆری تەڵاق و جیابوونەوە لەم سەردەمەدا هەموو هۆکاری ئەوەیە پیاو و ژن گرنگی بە یەکتری نادەن، پیاو تاوەکوو درەنگانی شەو خەریکی یاری پۆپجی و کاتکوشتنە بە چاتی کچانی تر، بۆیە پیاو و ئافرەتی ئیماندار دەبێت ئاقڵ و ژیر بن و، چاو لە پێغەمبەرەکەیان ﴿ﷺ﴾ بکەن، دونیایەکی کاتی ئەوەندە ناهێنێ دوو کەسی ئازیزی یەک، دڵی یەکتر بشکێنن و ئازاری یەکتر بدەن، دەبێت بیر لە سەرەنجامی خۆیان بکەنەوە، کە خراپبوونیان بۆ یەکتری لە کۆتاییدا دەبنە مایەی ناخۆشی و خەم و خەفەت و ژیانی هەردوو لایان دەفەوتێ و منداڵەکانیان دەبنە قوربانیی خراپبوونی دایک و باوکیان، بۆیە پیاو و ئافرەتی ژیر و ئاقڵ یەکەم لە ترسی خودا زوڵم و ناپاکی لە یەکتری ناکەن، پاشان لەبەر منداڵەکانیان و ئەو مەسروف و ماندووبوونەی لە ژیانی یەکتریان بینیوە، نایانەوێ خراپ بن بۆ یەکتر، ئیسلام و ئیمان وایان لێ دەکات یەکترییان خۆش بوێت و تەنیا چاویان لەسەر یەکتر بێت و بۆ یەکتر بژین.

بەڵێ، پیاو و ئافرەتی ئیماندار بەبێ گەڕانەوەیان بۆ ئیسلام و شوێنکەوتنی پێغەمبەرەکەیان ﴿ﷺ﴾ بەختەوەری و ئاسوودەیی بەدەست ناهێنن، بۆیە چاو لە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ و پێشەواکەتان بکەن، تاوەکوو ژیانێکی کامەران و دوور لە کێشە و ناخۆشی بەدەست بهێنن.

كە وا بوو، ئەی هاوسەرانی ئیماندار، بزانن چۆن لە دونیادا ژیانێكی بەختەوەر لەگەڵ ئەو كەسەی هەڵتبژاردووە بەسەر دەبەی؛ تۆی ئافرەت گەر ژیر و ئاقڵ بیت لەجیاتیی باسی كچ و باسە دونیاییەكان دەتوانی لەگەڵ پیاوەكەت باسی قیامەت، ژیان و مردنی پێغەمبەر ﷺ ئەزیەت و ئازاری هاوەڵان و ماندووبوونیان لە گەیاندنی ئیسلام بكەیت، ئەو كات زیاتر خۆشەویستی دەكەوێتە دڵی، كە دەزانێ خێزانێكی چەندە ژیر و تەقوادارى هەیە، بۆیە ڕەحمەتتان لێ بێت كە خۆتان پێ موسڵمانە دەبێت چاو لە ڕەوشت و ئاكاری جوانی پێغەمبەرەكەتان ﷺ بكەن و، بزانن كێ هەڵدەبژێن، بۆ ئەوەی ئەم تەمەنە كورتەی ژیانی دونیا لەگەڵیان بەسەر ببەن، كەسی ئەهلی ئیمان و ئیسلام هەڵدەبژێرن یان كەسی دونیاپەرست و دوور لە دین و ڕەوشتی جوانی پێغەمبەرەكەتان ﷺ دەیانكەن بە هاوبەشیی ڕێگەی خۆشی و ناخۆشیی ژیانی پڕ لە كۆسپ و كەند و زۆری تاقیكردنەوەی دونیا.

## ئامۆژگارییەکی دڵسۆزانەی تایبەت بۆ برایانم

بۆ پێکهێنانی ژیانی هاوسەرگیری هەر تەنیا کچەکان بەرپرس نین و بەڵکوو کوڕەکانیش خەتابارن، نابێ تەنیا بڵێن دەبێ کچان مەرجیان ئیمان و ئەخڵاق بێ و کوڕانیش لەبیر بکەین، دەبێ برایانی ئیماندار ئەوانیش کاتێک کە هاوسەرگیری دەکەن، دەبێ مەبەستیان تەنیا ڕەزامەندیی خودای گەورە بێت، نەک بەدوای مەبەستە دونیاییەکان بن بۆ جوانی و باڵابەرزی و بەدوای تەمەنی بچووک بگەڕێن، ئێمە لێرە باسی کوڕە دونیاپەرست و دوور لە ئیسلام و بە دواکەوتووی مۆدێل و فاشیۆن ناکەین، چونکە ئەوان جیاوازن و تێ ناگەن و خۆشیی دونیا پەردەی دڵیانی داپۆشیوە، بۆیە دوور کەوتوونەتەوە لە ئیسلام، هەربۆیە پێغەمبەری خودا ﷺ ئاگاداری کردووینەتەوە لە ڕۆچوونمان بەرەو دونیا و خۆشی و ڕازاوەکانی، دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ مِمَّا أَخَافُ عَلَيْكُمْ من بَعْدِي مَايُفْتَحُ عَلَيْكُمْ مِنْ زَهْرَةِ الدُّنْيَا وَزِينَتِهَا﴾[١] واتە: ئەوەی لەدوای خۆم دەترسم توشتان بێت، ببێتە مایەی دورخستنەوەتان لە دینەکەتان خۆشی و ڕازاوەیی ئەم دونیایەیە کە زۆر کورتە و بەخێراییش دەبڕێتەوە.

کە وا بوو، دەبێت گەنجی دیندار و خاوەن ئیمان زۆر جیاواز بێت، چونکە لە حەقیقەتی ژیانی دونیا تێ گەیشتووە کە تەنیا ڕابواردنێکی کەمە، دەزانێ ئەم

[١] - {متفق عليه}

ژیانەی دونیا مانەوە تێیدا ماوەیەکی زۆر ناخەیەنێ، مانەوەی یەکجارەکی لە دونیایەکەی ترە کە قیامەتی نەبڕاوەیە.

﴿ إِنَّمَا هَذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا مَتَاعٌ وَإِنَّ الْآخِرَةَ هِيَ دَارُ الْقَرَارِ﴾[1] واتە: بەڕاستی ژیانی ئەم دونیایە ڕابواردنێکی کەمە وە، هەر پاشەڕۆژ جێی حەسانەوەی ئەبەدییە.

بۆیە هیچ گرنگ نییە بۆ ئەو گەنجە دیندارە، چۆن ژیانی دونیا بەڕێ دەکات، بە هەبوونی یان نەبوونی، بەڵکوو گرنگترین شت کە خەمی بێت تەنیا ڕەزامەندیی خودای گەورەیە، نەک دڵخۆشکردن بەڕازاوەیی و ڕابواردنی ئەم ژیانە کاتییە. بەڵێ، تەنیا هەوڵی ئەوە دەدات بە هۆی کار و کردەوەی چاکە کە فەرمان و ڕەزامەندیی خودای گەورە پاشان پێغەمبەری ئازیزی ﴿ﷺ﴾ لەسەرە ئەم تەمەنەی ژیانی دونیا بباتە سەر، بۆیە دەبێ لە هەموو کارەکانی و گشت جوڵانەوەیەکی و تەنانەت هاوسەرگیریش مەبەستی تەنیا ڕەزامەندیی خودای گەورە بێت.

بەڵام بە داخەوە لەم سەردەمەی پڕ فیتنە و ناخۆشییەدا، خەریکە شەپۆلی گومڕایی و فەسادی، ئیمان لە دڵی گەنجی دیندار نەهێڵێ و ساردی بکاتەوە، لە بەندایەتی بۆ خودای گەورە ڕووە و کەناری کاروانی دونیاپەرست و شوێن پێی شەیتان و هەنگاوەکانیان فڕێیان بدات.

---

[1]- سورەتی غافر، ئایەتی (٣٩).

ئەمەش بە هۆکاری بەڕەڵایی، فیلمی دۆبلاژکراوی بەدڕەوشتی و ئەکتەرە داوێنپیس و گۆرانیبێژە فاشیلەکان، کە هەموویان ئێستا جوانکاری بە دەرزی و دەرمان و شتی دەستکرد کە لووت، لێو، ڕوومەت و هتد. دەکەن و گشت لاشەیان تەجمیلە و جوانییەکەیان سروشتیی خۆیان نییە، بۆیە گەنجیان هەڵخەڵەتاندووە و، وا دەزانن دەبێ هەموو کچێ ئاوا جوان بێت، بۆیە کوڕەکە کاتێ دەچێتە داوای کچێکی دیندار جوانکاریی نەکردووە لە ترسی خودا، کاتێ دەیبینێ شێوەی چۆنە پەشیمان دەبێتەوە، بۆیە نایخوازێ، کوڕەش بەدوای کچی جوان و تەمەنی بچووک دەگەڕێت.

بەڵێ، بەڕاستی ڕۆژگارێکی زۆر سەیرە ڕۆژبەڕۆژ خەڵکی پشت لە ئیسلام و مردن و قیامەت دەکەن، بۆیە ئەهلی کوفر سەرکەوتووبوون لە تێکدانی ئەخلاق و ڕەوشتی کۆمەڵگەی موسڵمانان، ئافرەتیان ڕووت کردەوە، بیر و هۆشی مەلا و زانای دینییان کڕی و بە دڵی خۆیان بەکاریان دەهێنن و فتوایان پێ دەدەن و ڕێگەی خەڵکی دەشێوێنن، گەنج و لاوەکانیان سەرقاڵی فیلم، یاریی پۆپجی، ئافرەتی فاشیۆن و سفوور و لەشفرۆشی کردن؛ بەم شێوەیە و دەیان ڕێگەی تر ئیسلامی حەقیقی و ڕەسەن کە خودای گەورە پێی ڕازییە لەنێو موسڵمانیان داماڵی، وایان لە خەڵکی کرد بیریان تەنیا لای تێرکردنی سک و دوائێنیان بێت، هیچ بیریان لای دواڕۆژ، حەشر، حیساب و قیامەت نەبێت.

بۆیە سەردەمێکە کەس بەکەس نییە و لە نەبوونی حوکمی پاک و بێگەردی ئیسلام و دادگایەکی دادپەروەر و یەکسان کێشە و ناخۆشییەکان ڕوویان لە

زیادبوونە، مەگەر تەنیا خودا بەزەیی بە حاڵماندا بێتەوە، هەر دین و قیامەتمان نەدۆڕێت و بەهەشتمان لەکیس نەچێ، ئەوە گرنگە.

ڕەحمەتت لێ بێت، ئەی گەنجی خوداویست (ئەی براکەم)، ئەگەر لەم ژیانە مەبەست و ئاواتت ئەوەیە بۆ خودا بژییت بە ژیانێکی بەختەوەر، ئەوا بۆ ژیانی هاوسەرێتی بەدوای جوانی و کەشخەیی و باڵابەرزییەوە مەبە، تاکە مەرجت با عەقیدە و ئیمان بێت، نەک جوانی و مەبەستی تری دونیایی کە جوانی کوڕ و کچ هەتا سەر نییە و ڕۆژگار جوانی ئەو کچەی کە شەیدای بوویتە پیر و چرچی دەکات، دوای منداڵبوون گۆڕانکاری بەسەردا دێت.

﴿ثُمَّ جَعَلَ مِنْ بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً﴾[1] واتە: لەدوای گەنجیتان و بەهێزبوونتان لاوازی و پیریکردن.

کە وایە، ئەو جوانییەی بەدوای کەوتووی کاتییە و زوو بەسەر دەچێت و سەرەنجام پیری و نەخۆشی دەبێتە جێگرەوەی، ئەوەی گرنگە تەنیا دین و ئەخلاق و ئیمانە، سوێند بە خودا جگە لە دین و ئیمان، ئافرەت بۆ جوانی، باڵابەرزی، ناوبانگ و بنەماڵە هەڵبژێرن بەختەوەر و ئاسوودە نابن!

ئێمە ناڵێین، با جوان نەبێت، بەڕاستی هەموو دروستکراوی خودای گەورەین، بەس عەیبە موسڵمانێک بەڕاستی لە ئیسلام و لە مانای ژیانی دونیا تێگەیشتوو بێت کە تاقیکردنەوەیە و مانەوەی کاتییە، تەنیا و تەنیا بەدوای جوانییەوە بێت.

---

[1]- سورەتی الروم، ئایەتی (٥٤).

ئەو کچەی دەتەوێ بیکەیتە هاوژینت جوانییەکەی تەنیا ئەوەندە بێ هەر بە سەیرکردنی دڵت ئارام بێ و تەواو، ئەوەندە جوانییە بەسە، دڵت پێی ئاسوودە بێت.

ئەی براکەم، بزانە ئەم ژیانەی دونیا کاتییە ئەوەندە ماندووبوون و خەم و ئازارەی ناوێت سەرت لەپێناو شتێکی کاتی سپی بکەیت، بەڵکوو تۆ ئەگەر ژیر و ئاقڵ بیت بۆ خودا سپی دەکەی، بۆ ڕازیبوونی خۆی لە خۆت تێ دەکۆشی، تاوەکوو بێبەش نەبی لە خۆشیی بەهەشتی پڕ لە ناز و نیعمەت.

بەڵام بە داخەوە زۆرێک لە برایان کەوتوونتە دوای دونیاوە، چەندان کچی تەقوادار و موحیدیان بۆ داوا کراوە ڕۆیشتوون بۆ یەکتر بینین، کچە تەنیا مەرجی ئیمان و ڕەوشت بووە، بەڵام کوڕە ڕازی نەبووە، لێیان پرسیوە کوڕەکە بۆ ڕازی نەبوویتە، گوتوویەتی برۆی گەورە بوو، سبحان الله کچەکە تەنیا لەسەر ئەوەی برۆی نەکردووە وەکوو کچی سفوور، بۆیە کوڕە بە ناو دیندارەکە ڕازی نەبووە، چونکە برۆی گەورە بووە.

ئەمە و دەیان نموونەی تر کە کوڕەکان لەسەر شتی بچووک و سادە بە کچی دیندار ڕازی نەبوونە.

نموونەیەکی تر باس دەکەین کە خوشکێکی ئیماندار باسی ئەو حاڵەی بۆ کردین، پێم باش بوو لێرەوە باسی بکەین، و بیکەینە پەیامێک بۆ ئەو کوڕانەی خۆیان پێ دیندارە؛ بەڵکوو سوودێکی هەبێت کەمێک بەخۆماندا بچینەوە و

كە ئیمان و ئیسلام بەرنامەی ژیانمان بێ و بەم شێوەیە بیر بكەینەوە ناچێتە قالبی ئیمانداریمانەوە.

ئەم خوشكە گوتی: "كوڕێك چووە بۆ داوای كچێكی هاوڕێم، لەبەر ئەوەی كوڕەكە پێبەند بووە بە دین، زۆر لەخوداترس بووە خەڵك ناسیویەتی، بۆیە كچەكە گوتوویەتی بە هەموو شتێكی ڕازیم، من تەنیا دینی كوڕەكەم دەوێ، هیچی تر نا، نە زێڕ نە ماڵ هیچ شتێك!

تەنانەت من ئاگاداری ئەم كچەم كە مووچە و پارەی خۆی هەبووە گوتبووی ئەو پارەیەی هەمە كە كۆم كردووەتەوە خەرجی دەكەم بۆ پێداویستیی ماڵەوەمان ئەگەر هاوسەرگیرییەكەمان ڕێك بوو.

پاشان كوڕەكە نەخۆشییەكی زۆر گەورەی هەبوو، كە هیچ كچێك قەبووڵی ناكات هاوسەرگیری لەگەڵ كوڕێكدا بكات بەو نەخۆشییەوە، چونكە زۆر قورسە بۆ ئافرەتان، كەچی كچەكە گوتبووی لەپێناوی خودا ڕازی دەبم، من دونیام ناوێ قیامەتم دەوێ حیساب بۆ قسەی خەڵكیش ناكەم لەبارەی پیاوەكەم چی دەڵێن، تەنیا و تەنیا لەپێناوی خودا بەم كوڕە ڕازی دەبم، تا لە گوناهـ پارێزراو بێت و یارمەتیدەری بم بۆ دەعوە و بانگەواز، چونكە كوڕەكە بانگخواز بوو زۆریش لە كچەكە گەورەتر بوو، كچەكەش جوانییەكی مامناوەندی بگرە زیاتریشی هەبوو، بەڵام بڵێی زۆر جوان یان جوانترین نەبوو.

كوڕەكەش گوتبووی: منیش كچێكی وام دەوێت، كەچی كاتێك كە یەكتریان بینیبوو.

کوڕەکە هیچ ڕەخنەی لە دین و ڕەوشت و کەسایەتی و پێبەندێتیی کچەکە نەبوو، چونکە هەر مەرجێکی دانابوو کچەکە ڕازی ببوو، پرسیاری کردبوو چی دەپۆشی؟

کچەکە گوتبووی عەبا دەپۆشم کوڕەکە گوتبووی: الحمدللّٰه ئافرەت دەبێ داپۆشراو بێت و زۆرم پێ خۆشە کە باڵاپۆشی.

کوڕەکە گوتبووی: حەزەکەم دەوام جێ بهێڵی کچەکە گوتبووی زۆر ئاساییە، چونکە خۆم قەناعەتم بە دەوام و چوونەدەرەوەی ئافرەت و تێکەڵی لەخوێندن نییە.

تا ئێستاش کە وازم لە دەوام نەهێناوە لەبەر ماڵەوە بووە، چونکە قەبووڵیان نەدەکرد دەوام جێ بهێڵم، هەموو کات گوتوومە هاوسەرگیری بکەم دەیکەمە مەرجی سەرەکیم بۆ هاوسەرگیری قەبووڵمە، تەنیا لەپێناو دین و پێبەندیت...

کەچی دواتر کوڕەکە دوای دوو ڕۆژ وەڵامی دابووەوە کە قسمەت نابێت"، لێرەدا ڕوون و ئاشکرایە کە کوڕەکە تەنیا لەبەر جوانی کچەکەی نەویست و هیچ حیسابی بۆ دین و پێبەندێتی و ڕەوشتی بەرز و جوانییە مامناوەندییەکەی کچەی نەکرد...

لە کاتێکدا لە هەموو شتێک لە یەکتر نزیک بوون و هیچ ڕاجیاییەکیان نەبوو، گوتی تەنیا هۆکار لەبەر جوانییەکەی ڕەتی کردبووەوە، کچە بە هەموو مەرجەکانی ڕازی ببوو.

بە داخەوە بۆ ئەو گەنجانەی تەنیا بەدوای جوانی و کەشخەیی و قۆزی کچانن لە کاتێکدا خۆی پێ لەخوداترس و موسڵمانیکی پێبەند و بەدینە.
بۆیە براکانم، بەژیری و ئاقڵانە بیر بکەنەوە (ڕەحمەتی خوداتان لێ بێت)، ئەو کچەی جوانییەکی مامناوەندی هەیە، هەر بەسەیرکردنی دڵت ئاسوودە بێت بەسە، ژیانت بەختەوەر بێت گرنگترین شتە، چەندان کچی تەقوادار و خاوەن ئیمانی تێگەیشتوو هەن، لەپێناو گەنجی دیندار پارەی گرتووە (دەخیلەی داناوە)، بۆ ئەوەی بیبەخشێ بەو کوڕە دیندارەی کە دێتە داوای، بۆ ئەوەی خەرجی و ئەرکی لەسەر ئاسان بکات، تکایە ئەم کچە دیندارانە شایەنی ئەوە نین ڕێزیان بخە سەرچاوت ئەی براکەم، بۆیە دوودڵ مەبە لە بەدەسهێنانی ئەم کچە ژیر، ئاقڵ و خوداویستانە، دڵنیا بە لە ژیانت سەرفراز و بەختەوەر و دڵخۆش دەبی لەگەڵیدا.
پاشان ئامۆژگاریی تر بۆ برایانمان ئەوەیە کاتێک دەچنە خوازبێنی کچی موحید و یەکخواپەرست، زۆربەیان باوک، مام و برایان جاهیل و نەزانن و هیچ لە ئیسلام تێنەگەیشتوونە، وا دەزانن ئیسلام تەنیا دوو ڕکات نوێژ و ڕۆژی ڕەمەزان و چەند زیکر و پاڕانەوەیەکە؛ ئیتر تۆ بەهەشتیی و پێویستت بە هیچی تر نییە لە ئیسلامدا بیکەی، بۆیە کاتێك تۆی گەنجی یەکخواپەرست و موحید دەچیتە داخوازی، لە مەجلیس لای ماڵەوەیان بزانە چی دەڵێیت، نەکەی بچی باسی کافرێتیی فلان حیزب و فلان شێخ و مەلا بکەی و قسەی توونديان لا بکەی، ئەو کاتە بە توندڕەو و تیرۆرست لێت دەگەن و کچەکەیان پێت نادەن و ڕەتت دەکەنەوە و ژیانی ئەو کچەش دەفەوتێ و بەیانی کوڕی شەلاتی و

عارەقخۆر بێتە داوای کچەیان یەکسەر پێی دەدەن، بۆ ئەوەی نەیدەن بە گەنجی یەکخواپەرست، چەندان خوشکی ئاوا هەبوون نیقاب و عەبا بە هۆکاری ئەوەی ماڵەوەیان بۆیان دەرکەوت ئەو گەنجە یەکخواپەرستانە چۆنن و عەقیدەیان چییە، کچی خۆیان دا بە کوڕی جاهیل و ژیانی کچەش فەوتا و دوور کەوتەوە لە ئیسلام و نیقاب و عەباکەی وازی لێ هێنا و لەگەڵ گەنجی دونیاپەرست و نەزان ژیانی دونیا بە ناچاری بەڕێ دەکات.

بۆیە دەبێ کوڕ و کچی ئیماندار بۆ ئەوەی بە یەک بگەن، هەموو قوربانی و ماندووبوونێک بدەن، پێش ئەوەی کوڕەکە بچێتە ماڵی کچە، هەوڵ بدەن بە ڕێگەی شەرعی لە ڕێگەی مەحرەمێکەوە یەکتر ببینن و باسی مەرجەکانی خۆیان بکەن و ڕێگەچارە و ئاسانکاری بە یەکتری بڵێن و، چی بکەن و چۆن قەناعەت بە ماڵەوەی یەکتر بهێنن.

ئەو کاتە کە خودا ویستی، بۆ یەکتر بوون بە دڵی خۆتان چۆن خودای گەورە پێی ڕازییە بەندایەتی بۆ بکەن و، ڕیش بهێڵەوە و خێزانەکەتیش ببێتە عەبا و نیقاب، بۆیە ئەم کارە لێزانین و حیکمەتی دەوێت، تاوەکوو بە یەکتری دەگەن.

خودای گەورە ڕەحم بە هەمووومان بکات و بۆ هەموو ئەو گەنجانەی دەیان ئەوێت دوور بن لە حەرام هاوسەرگیرییان بۆ ئاسان بکات، (امین).

## ئامۆژگاریەک بۆ ئەوانەی چوونەتە ژیانی هاوسەری

بەڕاستی مرۆڤ زۆر سپڵە و بێوەفایە بەرانبەر بە نیعمەت و بەخششەکانی خودای گەورە، زوو چاکە و نیعمەتەکان لەبیر دەکات، ئەگەر نیعمەت و چاکەکانی خودا بەسەرمان بژمێرین، ئەوا ناتوانین، ئەگەر بێت و چاوێکمان کوێر بێت، ئەو کات هەست بە نیعمەتی ئەو چاوە ساغەی ترت دەکەیت، کە بەخششی خودا چەندە گەورە و عەزیمە بەسەر تەوە، یان ئەگەر هەستی بۆن و تامکردنت نەمێنێ ئەو کات نرخ و قەدری ئەو نیعمەتە دەزانیت، بۆیە ئەگەر نیعمەتەکان بژمێرین کە خودای گەورە بەسەری ڕشتووین، ئەوە بە هیچ شێوەیەک بۆمان ناژمێردرێت! ﴿وَإِنْ تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللَّهِ لَا تُحْصُوهَا﴾[1] واتە: خۆ ئەگەر بەهرە و نیعمەتەکانی خودا بژمێرن، ئەوە ناتوانن و بۆتان ناژمێردرێن.

بەڵام بەڕاستی مرۆڤ زۆر بێوەفا و لەبیرکەری ناز و نیعمەت و چاکەی خودایە و، هەر زوو دەگۆڕێت و دوای نەفس و هەواو و ئارەزووی دەکەوێت!

﴿إِنَّ الْإِنْسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ﴾[2] واتە: بەڕاستی مرۆڤ زۆر ستەمکار و کوفرکەر و سپڵەیە.

ڕاستییەکی تاڵ هەیە، دەبێ بیزانین ئەو کوڕ و کچانەی خۆیان پێ موسڵمان و ئیماندارە کە ماوەیەکی زۆر چاوەڕێ بوون و ئاواتەخوازی ئەوە بوون بچنە ژیانی هاوسەرێتی، لە پاشان خودای گەورە بە ڕەحم و میهرەبانی خۆی زۆرێک لەو کوڕ و کچانەی بەیەک گەیاند و گەیشتن بەو ئاواتەیان، کە هەموو خەم

---

[1] - سورەتی الابراهیم، ئایەتی (٣٤).

[2] - سورەتی الابراهیم، ئایەتی (٣٤).

و خەفەتیان ئەوە بوو بەو ڕۆژە بگەن و شوو بكەن و ژن بێنن، چونكە هیچ كوڕ و كچێك نییە كە بیر لە ژیانی داهاتووی نەكاتەوە، كە ئاوات بۆ ژیانێكی بەختەوەر لە خەیاڵ و مێشكی بنیات دەنێت كە چۆن بۆ دوارۆژی ماڵێكی خنجیلانەی هەبێت، ژیانی دونیا وا دەخوازێ كە كوڕ و كچ بەیەكەوە بژین و تەواوكەری یەكتر بن و بەبێ یەك نەتوانن ژیانی دونیا بەڕێ بكەن و بژین، بۆیە زۆرێك لە گەنجان كاتێ تەمەنیان دەگاتە كاتی هاوسەرگیری، ئەو كاتی كەمێك لە تەمەنیان هەڵبكشێ بەرەو سەرەوە زۆر ڕوو لە خودا دەكەن، لە ترسی ئەوەی تەمەنیان زۆر بووە، دوعاكانیان بەردەوام ئەوەیە (ئەی خودایە) كەسی چاكمان پێ ببەخشی، (ئەی خودایە) زوو كەسێكمان بۆ بنێری، ئەو كات لەنێو خەڵكی زۆر تەقوا و دینداریان پێوە دیارە، جا كاتێك هاوسەرگیرییان دوا دەكەوێ، بەردەوام بە ناسیاو و خزمەكانیان دەڵێن دوعامان بۆ بكەن، تا مرازی دڵمان حاسڵ بێ، زۆر دەترسێن و خەم دەخۆن، بۆیە كاتێك خودای گەورە دەرگەی بەزەییان لێ دەكاتەوە. ﴿يُدْخِلُ مَن يَشَاءُ فِي رَحْمَتِهِ﴾ [١].

واتە: ئینجا ئەو كەسەی خودا بیەوێت دەیخاتە ژێر سایەی بەزەیی خۆیەوە.

بۆیە بە ویستی خودا كاریان بۆ ئاسان دەبێ، ژن دێنن و شوو دەكەن، بەڵام ئەو كوڕ و كچە هەر زوو ڕەحمەت و میهرەبانیی خودا لەبیر دەكەن، ئەو خەم و ئازار و ترسەی پێش هاوسەرگیرییان لەبیر دەچێتەوە.

هەر لە یەكەم ڕۆژی مارەیی سنووری یاسای خودا دەبەزێنن، كچەكە پێشتر بە ناو حیجاب و باڵاپۆش بوو، بەڵام لە ڕۆژی مارەیی جوانیی خۆی هەموو بەدەر دەخات، زۆرێكیان بگرە لە ڕۆژی مارەیی و گواستنەوە برژانگ و نینۆكی

---

[١] - سوورەتی الانسان، ئایەتی (٣١).

دەستکرد بەکار دێنن، تا خۆیان بەدەر بێخن لەو ڕۆژە بە شێوازێکی ناشەرعی پیاوەکە ژنی دەکاتە بووکەشووشەی مۆزەخانەکان بۆ ئەوەی هەریەکێک لە خەڵکی بێن سەیری بکەن و لە فەیسبووک و تۆڕەکان وێنەکانی ڕۆژی مارەیی و گواستنەوەیان بڵاو بکەنەوە، هەر زوو ئیمان و ئیسلامەکەیان وەکوو بەفری بەر هەتاو دەتوێننەوە.

بەڵێ، هەموو شتێک لەبیر دەکەن و کاتێک دەچنە ماڵی خۆیان و گواسترانەوە گاڵتەوگەپ دەکەن بە هاوڕێکانیان و سینگڵ سینگڵ بەوانە دەڵێن، کە نەچوونەتە ژیانی هاوسەرێتی.

وا دەزانن هەموو شتێک بە ویستی خۆیانە، بیریان دەچێت کە پێشتر خۆیان هەمان حاڵیان هەبوو، ئاواتیان ئەوە بوو بچنە ژیانی هاوسەرێتی، بۆیە حاڵی خۆیان لەبیر دەچێتەوە و گاڵتە بەو کەسانە دەکەن کە حاڵیان هەمان حاڵی ئەوان بووە، لەبری ئەوەی دوعای خێریان بۆ بکەن و دڵیان بدەنەوە، بۆ خۆیان داوای دوعای بەختەوەریان لێ بکەن و پێیان بڵێن: ئارام بگرن هەموو شتێک و لێدانی ترپەی دڵەکان بە ویست و بڕیاری خودای گەورەیە.

﴿وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا﴾[1]. واتە: هیچ گەڵادارێکیش بێ ئاگاداری و فەرمانی ئەو ناوەرێت.

بۆیە موسڵمانی ژیر نابێ قسە لەسەر شتێک بکات، کە لە توانای مرۆڤ نەبێ، هەموو گەنجێک ئارەزوو دەکات جوانترین ژن و قۆزترین کوڕ ببێتە هاوسەری، بەڵام سەرەنجام وا نەبووە قەدەر و قسمەت شتێکی تر بووە!

---

[1] - سورەتی الانعام، ئایەتی (٥٩).

کەس نییە حەز نەکات ژن بهێنێ و شوو بکات، چونکە خودای گەورە وای دروست کردووینە کە پیاو و ژن بەبێ یەک نەژین و پێبەند بوونیان بە یەکتری هەبێ و هەموویان هەستیان بۆ یەک هەیە...
بۆیە زۆربەی ئەوانەی ژیانی هاوسەریان پێک نەهێناوە، بێگومان هۆکاری خۆیان هەیە، لەوانەیە باری دارایی باش نەبێ، یان ماڵەوەی ڕێگری لێ بکەن کە ژن نابێ لە جێگەی دوور و بنەماڵەی تر بێنێ، یان هەر هۆیەکی تر جەنابت کە گاڵتە دەکەی لای خەڵک و بە پۆستەکانت سینگڵ ئاوا و ئاوا تۆ لە ماڵی خۆتی و لەگەڵ خێزانتی ئاگات لە حاڵی خەڵک نییە چۆن ژیان بەڕێ دەکەن بەخۆشی یان ناخۆشی، جەنابیشت سەرەتا ڕەبەن و سینگڵ بوویت؛ خودا دەرگەی بەزەیی لێ کردیەوە و چوویتە ژیانی تر، کە وایە لە خودا بترسە و واز لەو سیفاتە ناشیرین و خراپانە بهێنە.
بە داخەوە ئیستاکە سەردەمی خۆدەرخستن و خۆنمایشکردنە، کەچی لە واقیعیشدا ژیانیان جۆرێکی ترە، کە پڕە لە ناخۆشی و دووبەرەکی، بۆیە زۆربەی کوڕ و کچەکان کە چوونەتە ژیانی هاوسەرێتی تەنیا بۆ خۆدەرخستن و لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان وێنەی خۆی و خێزانیان بە شیعر و وتە و قسەی باقوبریق بڵاو دەکەنەوە، لە ماڵەوەش دایم شەڕ و کێشە و قسەی ڕەق و ڕێز نەگرتنی یەکتر و بێئاگا لە حاڵی یەکتر و گرنگینەدان بە یەکە، بۆیە ئەو کەسانە جگە لە نەفام و نەزان هیچی تر نین، بیر لە خۆیان ناکەنەوە کە سەرەتا چۆن بوون، تاوەکوو سوژدەی سپاس بۆ خودا ببەن و سپاسی خودای گەورە بکەن.
بە داخەوە سەرەتا زۆرێک هەبوون پێش چوونە ژیانی هاوسەرێتی بەردەوام لە مەجلیس و کاریان لە تۆڕەکان پۆست و بابەتی بانگەوازی ئیسلام بوو،

دواتر چەندان پلە دابەزین و ئیسلام و ئیمان بەتەواوی لە هەڵسوکەوتوو و کرداریان نەما، دوای چوونە ژیانی هاوسەرێتی واز لە بانگەواز و پۆستکردنی بابەتی ئیسلامی دێنێ، تەنیا هێرشکردنە بۆ سەر ئەوانەی خێزاندار نین و نەچوونەتە ژیانی هاوسەرێتی لە کۆڵان و لە مەجلیس هەر ئیشیان گاڵتەکردنە، سینگڵ ئاوا و سینگڵ ئاوا ئەمە حاڵی سینگڵە، ئەمە بەسینگڵ دەچێ، ئەمە سووتاوە سینگڵە، ئەم جۆرە قسە و پۆستانەی دەیکەن لە تۆڕەکان لە کەسی ئیماندار و ئاقڵ ناوەشێتەوە، تەنیا لە نەفام و دونیاپەرستەکان دەچیت، یان پۆستەکانی و ستۆرییەکانی لەگەڵ خێزانی بڵاو دەکاتەوە، گەشتێکی شیرین لەگەڵ خێزانی دڵ لە فلان شوێن، ڕۆژێکی هەنگوینی لەگەڵ ئازیز و ترپەی دڵم، بەڕاستی زۆر شەرمە بۆ ئیماندار نازانم چۆن موسڵمانێکن! ئەگەرنا ئەمە ئەخلاق و ڕەوشتی ئیمانداری ڕاستەقینە نیە، چۆن ئەگەر ڕاست دەکەن یەکترتان خۆش دەوێت، لە ماڵەوە خۆشەویستیتان بۆ یەکتر دەرببڕن، نەک بە درۆ بۆ خۆدەرخستن بێت و، بۆ ئازاردانی دڵی برا و خوشکە ئیماندارەکان بێ، کە لەم ڕۆژگارەی پڕ لە ناخۆشی و فیتنە و نەبوونییە، زۆربەی لەبەر هەژاری و نەبوونی ناتوانن بچنە ژیانی هاوسەرێتی، یان زۆرێک کچ هەن بە دەست باوک و برا دەچەوسێنرێنەوە، نایاندەن بە کوڕی ئیماندار و ئەهلی ئیسلام یان کوڕێک لە بنەماڵە و قەومی خۆیان نەبێت، یان بە هەر هۆکارێک بێت نەتوانن ژیان پێک بهێنن، بۆیە تۆ نازانی حاڵی خەڵکی چۆنە و چۆن نییە؛ بۆیە لەخودا بترسن و لێپرسینەوە لە نەفسی خۆتان بکە، لە خۆتان بپرسن لەگەڵ هاوسەرتان چۆن بۆ خودا بژین و چۆن ڕەزمەندیی خودا بەدەست بێنن و چۆن خزمەتی بەرنامەی پاکی ئیسلام

بکـەن و منداڵـەکانتان چـۆن پەروەردەیـەکی ئیمـانی فێـر بکـەن، تـاوەکوو لە بەهەشـتدا لەگـەڵ خێزان و منداڵەکـەت بەیەکەوە بـن، نەک تەنیـا خەریکی پۆستی بێئیش و بێسوود بن.

ئەگەر ئێوە خۆتـان پێ موسڵمانە، ئەوە بزانن بەرنامەکەتان کە ئیسلامە نـامۆ و غەریـبە، پێویسـتی بە سەرخسـتن و بڵاوکـردنەوەیە تـاوەکوو یەکسـانی و دادپـەروەری و حـوکمی خـودای پەروەردگـار بەرقەرار بـێ لەسـەر زەوی، کە ئەمڕۆ ئیسلام کەسی وەک تۆی هەیە هەر خەریکی سینگڵ سینگڵ و لە کۆڵان و پشت دیوارەکان و لە پۆست و کۆمێنت بەگاڵتەئامێز هەر باسی ژنی دووەم و سێیەمە بـۆیە حـاڵی ئیسـلام نـامۆ و پەشێوە و برینـدارە و لەلایەن دوژمنـانیش چەقـۆی بەژەهـر لەبـرینەکە دەدەن، بـۆیە ئیسـلام حـاڵی ئـاوایە، کاتێک یاسـای ئیسـلام لە حـوکم و حوکمـداری مرۆڤـایەتی بـوو پیـاوی جـوامێری وەکـوو: شـێخ الاسلام ابن تیمیە (ڕەحمەتی خودایان لێ بێت) کە هەموو ژیانی بۆ دینی خـودا بردە سـەر و ژنی نەهێنا و هەموو تەمەنی لە زیندان و ئازاردان لەسـەر ئیسلام پیـر کـرد؛ هـاوەڵێکی ئـازا و بەجـەرگی وەکـوو "ئـەبو حەنـزەڵەی ئەنسـاری" بـوو (ڕەزای خـودای گـەورەی لێ بێـت) کە لە شـەوی زاوایەتیـدا گیـان و خۆشـیی دونیـای فیـدای ئیسـلام کـرد، لە باشـترین سـەدە و سـەردەم بـوو خۆشـی و ئـارەزووی نەفـس و ژنیـان کـردە قوربـانی بـۆ دینی خـودا، بـۆیە یاسـای ئیسـلام دادوەر بوو لە دونیا.

بەڵام بە داخەوە ئەو بە ناو موسڵمانە عاتیفانەی ئەمڕۆکە هەر زوو بەزەیی خودایان لەبیر دەکەن، دەکەونە گێژاوی هەوا و ئارەزووی نەفسیان، هەروەک خـــودای گەورە ئەم نموونـــە جـــوان و مانادارەمـــان بـــۆ دەهێنێـــتەوە و،

دەفەرموویت: ﴿ فَإِذَا رَكِبُواْ فِي ٱلْفُلْكِ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ﴾[١] واته: هەر كاتێک خەڵكی باوەڕلاواز سواری كەشتی دەبن، مەترسی نوقمبوون و تیاچوون ڕوویان تێ دەكات، زۆر بەكوڵ هانا و هاوار بۆ خودا دەبەن و بە دڵسۆزی و ملكەچییەوە باوەڕ دەهێنن، بەڵام كاتێک خودا ڕزگاریان دەكات و دەگەنەوە وشكانی، دەستبەجێ لە ڕێبازی یەكخواپەرستی دەترازێن و هاوەڵ و هاوبەش بۆ خودا بڕیار دەدەن.

بۆیە ئەمانەش سبحان الله بە هەمان شێوە وا دەكەن هەر زوو نیعمەتی خودا لەبیر دەكەن، كە پێش هاوسەرگیری حاڵیان چۆن بوو، چەند خەم و خەفەتیان هەبوو تا بچنە ژیانی هاوسەرگیری، بەڵام كە چوونە ژیانی خۆیان یەكسەر كیبر و فیز دەكەوێتە دڵیان گوایە چوونەتە ژیانی هاوسەرگیری، بۆیە خۆیان گەورە دەكەن و ناز و مەكریان لەپێش چاوی هەمووان لە دەرەوە و فەیسبووک و تۆڕە كۆمەڵایەتییەكان نیشانی خەڵكی دەدەن، گوایە ژیانیان پڕە لەخۆشەویستی و عەشق، بۆیە لە هەموو ڕوویەكەوە دەگۆڕێن هەتا لە ماڵ و شوێنەكان ئەم كچە جوانیی خۆی بەدەر دەخا و چەفیەی شل دەكاتەوە، پیاوەكەش ڕازییە، هەر زوو ژیانیان تاڵ دەبێ و شەیتان زاڵ دەبێ بەسەریان و دەكەونە كێشە و ناخۆشی و دووبەرەكی و ئازار ڕوویان تێ دەكات، ڕەحمەتتان لێ بێت لە خەمی ئێوەداین پێمان خۆشە ژیانتان خۆش بێ و بێكێشە بن، بۆیە ئەگەر هاتوو ڕۆژێک لە ڕۆژان ژیانت گۆڕا و خۆشی هەموو دونیا هاتە ناو لەپی دەستت، نەكەی بگۆڕێی و پشت لە یاسا و شەریعەتی خودا بكەی؛ ئەگینا پشتت زۆر بەسەختی دەشكێ و سەرەنجام ژیانت وێران دەبێ،

---

[١]- سوورەتی العنكبوت، ئایەتی (٦٥).

﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا﴾[1] واتە: هەر كەسێكیش لە بەرنامەكەم ڕوو وەرگێڕێ، ئەوا بێگومان ژیانێكی سەخت و ناخۆشی دەبێ، هەرچەند خاوەنی دونیایش بێ. بەڵێ، مرۆڤ هەر كە پێوەندی لەگەڵ خودا پچڕا دڵی تەنگە، بچووكە، بێئارامە، هەرگیز تێر نابێ

كە وا بوو، برا و خوشكی من، هەموو كات بەندەی خودا بە، پێش چوونە ژیانی هاوسەرێتی گفت و بەڵێن بدەن، مردن و ژیانتان بۆ خودا بێ و لێ بزانن چۆن لەگەڵ یەكتردا بۆ خودا بژین، هاوكاریی یەكتر بن لەسەر تەقوا و گرنگیدان بۆ تاعەت و عیبادەتی خودا و، ئەگەر هەردوو لاتان خوێندەوار بوون، ئەوا پێشبركێ لەگەڵ یەكتر بكەن بۆ لەبەركردنی قورئان، یان ئەگەر یەكێكتان قورئانی دەزانی و ئەوەی تر نەیدەزانی با هەوڵ بدات فێری بكات و سەبر سەبر و بە لێزانین و بەخشینی دیاری هەوڵدات هانی بدات و، هەروەها پێشنیازی ئەوەی بۆ بكات كتێبی ژیانی پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ یان ژیانی هاوەڵان و بابەتی بەسوود بخوێنێتەوە، بەو مەرجەی ئەو كات دیاری و خەڵاتی بۆ دەكڕێت، بۆ ئەوەی زیاتر پەروەردەی ئیسلام و ئیمان بێت ئەو كات بەختەوەری و ئاسوودەیی باڵ دەكێشێ بەسەر ماڵەكەیان و تاوەكوو دوور بن لە ناخۆشی، كێشە، دووبەرەكی، تەڵاق و جیابوونەوە و بۆ ئەبەدی ببنە یەك جەستە و و لە دواڕۆیشدا بە یەك شاد ببنەوە.

پێم خۆشبوو لە كۆتایی ئەم بابەتە ئەم نموونە ناپەسەندە باس بكەین لە نێو موسڵمانان بڵاوبۆتەوە بەتایبەت بەناو موحیدەكان ئەویش بەردەوام باسی ژنهێنانی دووەم و سێیەمە، لە پۆست و كۆمێنت و مەجلیسەكان باسی

---

[1] - سورەتی طه، ئایەتی (١٢٤).

جـورئەتی بەرامـبەر دەكەن بـۆ كـردنە دوو و سێ، گاڵتە پێـك دەكەن نـاوێری كۆمێنت بكەی، ناوێری باسی دوو ژنی بكەیت، بەڕاستی ناتوانین بێدەنگ بین لە ئاست ئەو هەلسـوكەوتەی جاهیلانەی بەنـاو موسڵمان، كاتێـك ئەو كارە جاهیل و نەزانینەیان دەبینین زۆر بێتاقەت دەبین، ئاخۆ بەتەمای ئەم جیلە بین حوكم و دادگەری بگەڕێنەوە بۆ شەریعەتی الله تعالی ئاخۆ لە نێو هاوەڵان و تابعین و ئەتباعی تابعین كێشمە كێشم لەسەر باسی ژن هێنان و كردنە دوو و سێ بـووە، ئـایە خەمی سـەرەكیان تەنها ژن و ڕابـواردن و خۆشی بـووە، بە تەعلیق و گاڵتە پێكـردن بەرامبەر یەك، یان خەمیان ئیسلام و سەرخستنی ئیسلام بووە، گرووپی فـرە ژنی دانێن و بەردەوام ئەو بەناو موحیدانە لەگەڵ ئافرەتەكان بكەونە دەمەقاڵێ و مناقەشە یەكتر بریندارکردن و یەكتر شكانەوە كە گوایە ئافرەت بە فرە ژنی ڕازی نیە، دوعا لەیەكتری دەكەن پیاوەكەت سێ كچت بەسەر بێنێ، یان قەت ژنی تر نەهێنێ، من پشتگیری نە پیاو نەژن هیچ كامیـان نـاكەم لەگەڵ شـەریعەت و بڕیـار و بەرنـامەی الله تعـالی م، بەڵام ڕاسـتیەك هەیە كە هەمووشـت بـۆتە چـاولێكەری و خۆدەرخسـتن ئەوانەی دەیكەنە دووژن و سێ زۆرینەیان بۆ تێركردن و خۆشی نەفسیانە، ژنی یەكەم ئیهماڵ دەكەن، كە تێربوون لە ژنی یەكەم و جوانی و سەرنج ڕاكێشی سەرەتای تەمەنی نەما بەهۆی منداڵبوون و تێپەڕبوونی تەمەنەوە بێ یان نەخۆشی بێت، چـاو دەبـڕنە ژنی تـر و هەوڵی هێنـانی ژنی دووەم دەدەن، كاتێـك هێنایـان ژنی یەكەم دەزانـێ ناعەدالـەتی و دادپەروەر نـیە بـۆیە دەبێـتە كێشـە و ئـاژاوە و ناخۆشی زۆرمان بیستووە بەو شێوە ژنی یەكەم سیحرو نوشتەی لە ژنی دووەم كردووە ژیانیان بۆتە پارچەیەك لە دۆزەخ، بۆیە ئافرەتەكان گشتی ترساون لە

زاڵمی پیاو بۆیە نایانەوێ ژنیان بەسەر بێت، وە خالی تر ئەوانەی دەکەنە دوو ژن بە دوای کچی تەمەن بچوک و ناسک دەگەڕێن، نەک کچی قەیرە و تەمەن گەورە بخوازن، یان ژنی تەڵاقدراو، بێوەژن بخوازن، بۆ ئەوەی ڕزگاریان بێت، بە گشتی لەگەڵ ڕێزم بۆ ئەو ئیمانداره ڕاستگۆیانەی کە هیچ خۆشی و ڕابواردنێکی دونیا نایانگۆڕن، گەرنا زۆرینەی بەدوای تێرکردنی نەفس و خۆشی و ڕابواردنی نەفسیانەوەن، گەر ڕاستگۆن دەڵێن لەخەمی مانەوەی کچانمانە بۆیە دەکەینە دوو ژن، ئەوا چەندان کوڕی بێ ژن هەن فەرموون یارمەتی ئەوان بدەن با ژن بێنێن، دوو کەس لە حەرام دووربکەونەوە بەهۆی تۆیەوە، بەڵام وانیە زۆربەی هاربوونە پەنا بەالله کە کابرا ژنی هێنا و ژیانی خۆشبوو و پارەو ئیش لەهیچی کەم نەبوو، هار دەبێت هانا بۆ هێنانی ژنی تر دەبات ژیانی خۆی و هەردوو ژنەش وێران دەکات، بەلام وەکو گوتمان ژنی بچوک و ناسک نەبێ نایخوازێت، بە کورتی سەردەمێکی زۆر سەختە ئومەتی ئیسلام بێنازەو بێ پەرژینە بەهۆکاری گومڕابوون مەژغووڵبوونی شوێنکەوتوانی بە خۆشی و هەڵاو بەزمی دونیاوە، هەر بۆیە پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ ئاگاداری کردووینەتەوە لە ڕووچوونمان بەڵای خۆشی و هەڵاو بەزمی دونیا.

بۆیە کاتێ ئەم هەڵسوکەتەی بەناو موسڵمانان دەبینین خەم و ئازار دامان دەگرێت، کە ئیمانداری پێشینانمان سەلەفی ساڵح چۆن بوون چەندە سووربوونە لەسەر بۆ خوا ژیان و بۆ خوا کارکردن و سەرخستنی ئیسلام، بۆیە لە ناچاری دەست دەکەین بە نووسین بەڵکو کەسانێک تۆزێ ترسی قیامەت لە دڵیانە سوود وەربگرن، بەڕاستی ئەوەندە خەڵکی ڕووەو دونیا و پشتکردن

لە ئیسلام و قیامەت هەنگاو دەنێن نازانین باسی چ خەمێكی ئەم ئومەتە بێناز و بێ پەرژینە بكەین.

یا ئیلاهی شەكوای حاڵی خۆمان و نەبوونی كەسانی دڵسۆز بۆ ئیسلام و ئیمانداران و مەزلوومیەتی ئەهلی ئیمان بۆ لای تۆ دێنین، شەكوای نەبوونی برا دڵسۆزە ڕاستەقینەكانی ئیمان و سەرخەرانی دین بۆ لای تۆ دێنین، شەكوای گشت دوور كەوتنەوەی خەڵكی لە ئیسلام و غەریبی ئومەتی محمد مستەفا ﴿ﷺ﴾ بۆ لای تۆ دێنین، یا ئیلاهی بە ئیمانداری نەبێ مەمان مرێنە یارب امین

# لە کۆتاییدا

سپاس بۆ خودای گەورە گەیشتینە کۆتایی، هیوادارم سوودی هەبێت بۆ خوشکانم بەتایبەت ئەوانەی کە ژیانی هاوسەرگیریان پێک نەهێناوە، ئەم ڕاستی و حەقیقەتە بزانن و کە تەنیا دین و ئیمان و ڕەوشتجوانی بکەنە پێوەر بۆ ژیانی هاوسەرێتی و تاوەکوو ئاقڵ و ژیرانەیش بڕیار بدەن کە ژیانی دونیا لەگەڵ چ جۆرە کەسێک بەسەر دەبەن و کێ هەڵدەبژێرن، چونکە بە داخەوە ئەو کچانەی سەرەتای تەمەنیانە زۆر عاتیفی و سادەن، وا دەزانن، هاوسەرێتی تەنیا کوڕێکی جوانە یان دەوڵەمەندی یان قۆزی و کەشخەییە، بۆیە زوو هەڵدەخەڵتێن و گەنجی جاهیل و نەزان هەڵدەبژێرن و پێیان ڕازی دەبن. کاتێک چوونە ژیانی هاوسەرێتی دەبینن ئەو ژیانە نییە کە ئەوان ئاواتیان بۆ دەخواست، ئەو کاتەیش پیاوێکی دڵڕەق و دڵپیس و خراپ و بێهەستیان هەیە بەناچاری دەبێت ژیانێکی دۆزەخی و بە نادڵی بەسەر ببەن و تەمەنیان لەگەڵی پیر بکەن، بۆیە خوشکانی من لە کۆتاییدا ئەو ڕاستییەتان بۆ دەرکەوت و لەم کتێبەدا ئەو بەسەرهات و ڕووداوانەتان خوێندەوە کە تەنیا و تەنیا دین و ئیمان و ئیسلام مایەی خۆشبەختی و ئاسوودەیی دونیا و قیامەتە.

بۆیە ئەگەر تۆ ژیر و ئاقڵ بی دەبێ پەند و وانەی لێ وەربگریت و ژیانی خۆت و ئیمانەکەت نەدۆڕێنی لەگەڵ پیاوی خراپ و نەزان بە یاسای خودا، ئەو دونیا کەمە و کاتییە شایەنی ئەوە نییە تەواوی تەمەنت بە خەم و کێشە و ناخۆشی

لەگەڵ پیاوی خراپ بەسەر ببەی و تەواوی ڕۆژەکانت بە ئازار و شەڕ و پێکنەهاتن لەگەڵ پیاوت بەڕێ بکەی تا شەو و، ڕۆژ بوویەوە دووبارە بەزمی دوێنێ بێتەوە و بێئاگات بکات لە عیبادەت و بەندایەتی و لەوەی بۆ خودا و ڕەزامەندیی خودا بژییت.
بۆیە گەنجی ئیماندار هەڵبژێرن بۆ ئەوەی ئەم تەمەنەی کەمی ژیانی دونیا بۆ ڕەزامەندیی خودای گەورە و پڕ لە خۆشەویستی و ڕێزەوە بەسەر ببەن، ئەگەر وا نەکەی هەر تۆی ئافرەت زەرەرمەندیی سەرەکیت و، دەبیتە قوربانیی دەستی پیاوە نەزان، خراپ، دڵڕەق و دونیاپەرستەکان، هەربۆیە تەواوی باسەکانی نێو ئەم کتێبەم تایبەت کرد بە ئامۆژگاری بۆ تۆی خوشکی ئیماندار.
خودای گەورە ئاگادارە بە نیەتی دڵمان نەمانویستوە دڵی کەس ئازار بدەین و خەم بە هیچ کەسێک بدەین، تکا دەکەین ئەگەر وشەیەکی نەشیاومان بەکار هێنابێت دڵتان ئازاری پێ چێشتبێ داوای لێبوردن لە خودا دەکەین پاشان لە ئێوەی ئیماندار.
هەر قسە و باسێکمان کردبێ لەم کتێبەدا لە خەمخۆری خۆمان بووە و، لە خۆشی و بەختەوەریی خوشک و برایانی ئیماندارم بووە، بۆیە هیوادارم دوای خوێندنەوەی بیروبۆچوونتان بگۆڕێت بەوەی گشت کارێک و فەرمانێکتان لەپێناو ڕەزامەندیی خودای گەورە بێت و سوودی هەبێ و بۆ ژیانێکی پڕ لە ئیمانی، لەنێو بازنەی ئیسلامدا هەموو قوربانییەک بدەن، چونکە لەم دونیا کاتییەدا هیچ شتێک و خۆشییەک بە ئەندازەی بۆ خودا-ژیان و لەگەڵ کەسانی سوڵحاو بۆ خودا-ژیان خۆش نییە.

بۆیە خودا دەکەینە گەواهیدەر کە ئێمە حەق و ڕاستیمان پێ گەیاندن و ڕوونمان کردەوە، ئیتر ئۆباڵی ناخۆشی و میحنەت و خراپی پیاوە جاهیل و نەزانەکان بە ئۆباڵی خۆتان.

داوا کارین لە خودا بەزەیی و میهرەبانیی خۆی بڕژێنێ بەسەر ئەو خێزانەی کێشە و ناخۆشی تەنگی پێ هەڵچنیوون و تەبا و دڵخۆش نین، خودای گەورە هیدایەتیان بدات و بەختەوەری و ئاسوودەیی بکاتە میوانی ئەبەدیی ماڵەکەیان.

خودای گەورە کاری ئەو کوڕ و کچەیش کە نەچوونەتە ژیانی هاوژینی ئاسان بکات و بە حەڵاڵی بە یەکیان شاد بکات و، ئەو کچانەی ماونەتەوە و جیابوونەتەوە کەسی چاک و ديندار بکاتە نسیبیان (ئامین).

داوام وایە هەر کەس ڕەخنە و پێشنیازی لەبارەی ئەم کتێبە هەیە بۆمان بنێرێت بەخۆشحاڵییەوە قەبووڵی دەکەین و دوعای خێری بۆ دەکەین.

**تێبینی:** مافی بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبە بۆ هەموو موسڵمانێکە.

بەندەی هەردەم پێویست بە خودای گەورە: عبدالله خاکی

**خوێنەری بەڕێز: داوام و ایە دوای خوێندنەوەی ئەم کتێبە بیدەی بە هاوڕێ و ناسیارەکانت تاکوو ئەو انیش سوود ببین بۆت ببێتە خێری نەبڕاوە.**

**{ وَمَا تَوْفِيقِي إِلَّا بِاللَّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ }**

# ناوەرۆک



| سەرە بابەت | ژمارەی پەڕ |
|---|---|
| پێشەکی چاپی یەکەم: مامۆستا ڕەنج شێخانی | ٦ |
| پێشەکی چاپی دووەم: مامۆستا ڕەنج شێخانی | ٨ |
| پێشەکی نووسەر: چاپی یەکەم | ٩ |
| پێشەکی نووسەر: چاپی دووەم | ١٢ |
| بۆچی ئەم کتێبەمان نووسی؟ | ١٤ |
| هۆی دڵەڕاوکێی کچان لە هاوسەرگیری و چارەسەری | ١٩ |
| تاکە بەرنامە بۆ بەختەوەری هاوسەران  تەنها ئیسلامە | ٢٤ |
| چی گرنگە بۆ ڕۆژی مارەبڕین و گواستنەوە | ٣٣ |
| هەڵسوکەوتی ژن و مێردی ژیر دەبێ چۆن بێت. | ٤٠ |
| بۆ هاوسەرگیری بەدوای مرۆڤی کامل و تەواو مەگەڕێ | ٤٨ |
| کاتێ کوڕدێتە داوای کچ باوک و برای چی بکەن..؟ | ٥٤ |
| هاوفیکربوون گرنگترین شتە بۆ هاوسەرگیری | ٦٣ |
| کچی ژیرو ئاقڵ لە گەنجی دیندار دوودڵ نابێ | ٧٠ |
| مەرجی کچی ژیر چیە بۆ هاوسەرگیری | ٧٧ |
| خۆشبەختیی هاوسەرگیری لە چیدایە؟ | ٨٥ |
| ئایە ئافرەت دەتوانێ خۆی پێشکەشی پیاو بکات. | ٩٨ |
| ئەی خوشکم تاوەکوو کچی نرخ و بەهای خۆت بزانە | ١٠٦ |
| ڕێگریکردن لە کچ زووڵمە، لەوەی بە دڵی خۆی شوو بکات | ١١٣ |
| خوشکم، کە گەنجیت تێپەڕی، پەشیمانی سوودی نییە | ١٢٩ |
| بۆ ئەو خوشکانەی شوویان نەکردووە و ماونەتەوە | ١٣٨ |
| بۆ بەختەوەربوون با پێغەمبەر ﷺ بکەین بە پێشەنگمان | ١٤٩ |
| ئامۆژگارییەکی دڵسۆزانەی تایبەت بۆ برایانم | ١٥٨ |
| ئامۆژگارییەک بۆ ئەوانەی چوونەتە ژیانی هاوسەری | ١٦٧ |
| لە کۆتاییدا | ١٧٨ |
| ناوەرۆک | ١٨١ |